بزووتنەوەی سیاسی و ڕۆشنبیری ی

لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەمەوە
تا ناوەڕاستی چەرخی بیست

بە ڕەزامەندیی وەزارەتی ڕاگەیاندن و
بە یارمەتیی وەزارەتی کاروباری ژوورو...
لە چاپ دراوە

# بزوتنەوی سیاسیو روشن بیری کورد

## لە کوتایی چەرخی نوزدەهەمەوە
## تا ناوەراستی چەرخی بیست

نوسینی
رمزی قزاز

★★★

## پێشــــــکەشـــ بێ :ـ

بەو کوردە دلسوزەی کە تەمەنی لاوی‌و پیری خوی بەخـــت ئەکا لە پێنـــا
رزگار کردن‌و سەربەخویی وولات‌و نەتەوەکەیا

بەو قارەمانە دلیرو نەبەزەی کە بە کردەوە سەلماندی بە دوست‌و دوژمنی‌و ها
جیهان کە پیشەوایەکی لی هاتووی نەتەوەکەیەتی‌و چاکەو دەستکەوتی وولاتەک
پیش چاکەو دەستکەوتی خوی ئەخا •

بەو کوردە دلسوزە هەولدەرو تیکوشەرەی کە ناوی کوردو کوردستانی ب
هەموو جهاندا بلاو کردەوەو ناساندی •

بە بـــاوکی کورد بـــارزانی مصطفـــی

« نـــوســــــــەر

* * *

## پێشــــــرەو :ــ

مێژووی کوردو کوردستان ، هێشتا بە تەواوەتـی ڕوون نەبوتەوە ، مـێژوو نوسانو ئەوانەی دەستیان دابێتە خامەو ئیازی نووســینیان بووبی لە بــارەی کوردەوە ، چ بێگانە ، چ خۆ ، تاکە تاکەیان نەبێت ، بە ئارەرووی خویان چونیاز نووسی بیو چیان وتبی ، نووسیویانەو وتوویانە ، مەبەستی بەرو دوایان ئەوەبو، کە بگەن بەو ئامانجەی ئەو نوسینەیان بو نوســیوەو بەســن ، ئــەوەیان لیــك نەداوەتەوە ، کە نووسینەکانیان لە پاشە ڕۆژا ، ئەبنە بەڵگەی مێژوو وە ئاوێنە بۆ دەرخستنی ڕووی ڕۆشنو تاریکیرابوردوی ئەو نەتەوەیە کە ئەمرو ئەوان ئــەو باسەی لە بارەوە دەنووسن ، جا بویە ئەلیم ، ئەوانەی کە نیازی نوسینیان هەیــا لە بارەی کوردو کوردستانەوە کودربن یان بێگانە ، پیویستە بچنە بنجو بناوانی ئەو باسە کە لیی ئەدوین وە زور بە قوولــی لــە ڕەگو ڕگیشــەی ئەو باســا بکولنەوەو دەرسی هەموو روویەکی بکەن ، وە بە هــەموو کەلێــنو قوژبــنو شوینیکیا بگەڕێنو بە شیوەیەکی وا ئەوەندە شارەزا ببن کە بگەنە راست تریــن ڕێگا بو نوسینەکەیان تا بتوانن لە سەر ئەو پشکنینو دەرس کردنە چوار چێوەی نوسینەکەیان داڕێژنو لە ڕێی راست لا نەدەن ، لایەنگری نەکەن ، لە بەر خاتری خاترانو بو دڵ نەوایی نەنوســن •

چونکە نوسینەکانیان ، ئەبن بە میراتی نەتەوایەتیو ئەمیننەوە بــو دوا ڕۆژی ئەو گەلە ، ئەگەر ئەو نوسینانە لە سەرچاوەیەکی روونو خاوینی پڕ لە راستیەوە نوسرابیو دوور لە لایەنگریو روالەتو دڵ نەوایی ، ئەوا ئەو نوسینانە ئەبنــا گەنجینەیەکی بەکەلكو پڕ سوود بو ئەو نەتەوەیەو ئەوانەی ئەیانەوی لە پاشەروژ

ە پێشوی ئەو نەتەوەیە بگەن ، خو ئەگەر ئەو نوسەرانە بی وجدانیان کردو لـە
ی‌ی راست لایان داو پیشکەوتنی میژوویان دەستکاری کردو گوریان ، تەوا ئەو
وسینانە هەر بەو جورە دەمیننەوەو ئەبنە تەوق‌و ئەچنە گەردنی ئەو نـەتەوەیەی
ەربارەی نووســراوە •

مەبەست لە نووسینی مێژووی نەتەوەیەك وە یا نوسینی ژیانی پیشەوایەك ئەوە
یە نوسەر هەرلایەنی چاکەی ئەو نەتەوەیە یان ئەو پیشەوایە بگری‌و ، بنووسی ،
ەلکو ئەبی نووسەر بۆ مێژوو بنوسی ، لایەنی چاك‌و خراپیان چـی‌یەو چونـە
ەمووی دەرخاو روونی بکاتەوەو بیان خاتە بەرچاو ، بو ئەوەی چینەکانی دوایی
ەتەوە کە دەیان خویننەوە لە چاکەیان کەڵك‌و سوود وەرگرن ، لە خراپەشیـان
بیرەت ، نووسەریك کە خامەی گرت بە دەستەوە بو نووسین ئەبی دووربی لـە
اطفە ، لایەنگری دڵ نەوایی کردن ، بە دوای دەستکەوتدا نـەگەری ، نووکـی
یروزی خامەی بەکری نەداو نەیفرۆشی ، بەڵکو ئەبێ نووسەرو خـامەکەی زور
اوین‌و راست بی ، چاکەو خراپە لە تای تەرازویەکا بکێشی‌و بینوسی ، بۆ ئەوەی
وێندکاری بەریز کە خوێندیەوە ئەو بە تەرازوی عەقل‌و رۆشن بیری خوی لایەنی
اکەو خراپەی ئەو نووسینە پارسەنگ بگری‌و هەڵی سەنگێنێ ، چونکە تا ئیستا
ەرگیز نەگونجاوە لە مێژووی نەتەوەکاناو ناشگونجیت یەکێك لەهەموو تەمەنی
یانیا هەموو کردەوەو کرداری هەر چاکە بوبیت‌و هەر چاکەشی بدریتە قەڵەم ،
راپەکانیش بکرین بە ژیر لیوەوەو دیزە بە دەرخونە بکرین

لە مێژوودا زوز زروفی سیاسی واریك کەوتوە بوە بەهوی بەهەلە چوون ، بو
ر پێشەواو پیاوی دلسوز ، کە ئەو بە هەڵە چونەیان بو بوتە کەم‌و کووری لـە

ژیانی سیاسیاندا ، نەك لە رەوشتو خویاندا ، چونکە رەوشتو خووی شخصی جیاوازە لە کارو باری سیاسی ، زور پێشەواو دەسەلاتدار هەن لە مێژوودا ئەبینین خاوەن جوانترین وە خاوینترین رەوشتو خوون وە بە خاوینی ناسر اون لە ماوەی ژیانیانا ، کەچی لە کاتو ماوەی دەسەلاتداریانا ، زرروفی سیاسی وایان هاتوتە پێش نەیان توانیوە بە سەریا برونو بە هەڵە چون ، جا ئەو بەهەلە چوونەیان بو بووە بە کەمو کوری سیاسی وە لە مێژوودا بویان نوسر اوەو لەکە داری کردون ، ئەمە مانای ئەوە نیە ئەو جورە پیاوانە خاوەن رەوشتو خوی جوان نەبوون ، واتە پێویستە لە سەر نووسەر بە تایبەتی ئەوانەی لە بارەی نەتەوەیەکو کردەوەی کرداری پێشەوایەکەوە دەنوسن کە خامەیان گرت بە دەستەوە زور بە پاکی خاوینی بنوسن خۆیان دورخەنەوە لە عاطفەو نووکی خامەکەی دانەنیت بو نوسینی درۆ بە قەدو بالای خەڵکاو دەستکاری رووداوی مێژوو ، راستی چییە وە چۆن بوە ئەوە بخاتە سەر قاقەز ، چونکە نووسەر مێژوو دەنووسیو بۆ مێژووشی دەنوسیو بەس ، ئەبی بی گومان ئەوە بزانیت کە لە دوای ئەوەوە نوسەری تر دیت وە لەو بابەتەوە کە ئەو نوسیوێتی ئەویش دەنوسیتو درۆو راستی ئەویش دەردەخا بە بەڵگەی زیندووەوە کە مێژوو بە درۆی بخاتەوە ، بویە لە نوسینی ئەم بەرتۆوکەدا کە هەشت سالی رەبەق لە گەڵی خەریکم وە سەرچاوەی زۆرم خویندوتەوەو دراسەیەکی قوولی بابەتەکەم کردوە کە دەینوسم تا توانیم ئەم جورە پێشکەشی بکەم بە خوێندکارانی کورد ، هەرچەند بی گومان کەمو کوری تیدایە ئەگونجی بە دلی زور کەسان نەبێت بەلام بە پێی وزەو توانام هەولێکی زورم داوە تا گەیشتوم بەم ئامانجە کە بتوانم خەمەتێکی بچوك پێشکەشی بکەم بە

ةتەوەکەم ، ئومیدم هەیە سود بەخش بێــت •

نــوســـــەر
رمـــــزی قــزاز

★★★

تێبینی : ــ زور سوپاسی پاریزەری بەڕیز کاك شیخ رؤف حفیــد زادە ئەکەم کــە
یادداشتە دەست خەتەکەی خوا لی خوشبو کاك احمد تەقی دامی لە گەڵ کتیبەکەی
« مس بیل » وە « ضحایا الثلاث »ی غلامی کە لەم سێ کتیبە کەلکی زورم وەــگ ت..

## کوردســـــتان :ــ

خاکی کوردستان کەوتوتە روژهەلاتی ناوەراستەوە ، ئەم خاکە هی دەولەتیك نیە ، خاکی کوردستان دابەشن کراوە لە بەینی ئیرانو تورکیاو عیراقو سوریادا ، وە لە یەکیتی سوڤیتا کورد هەن •

ووشەی « کوردستان » لە عیراقدا میری بە رەسمی دانی پیا نانیت لە نەخشەو پەرتووكو رەسمیاتدا ناوی ناهینیت ، لە ئەتلەسو لەو پەرتووکانەدا کە لە قوتابخانەکانا دەخوینندرین نانووسریت ، لە « ئیران » دا بە رەسمی بە ناوچەی « سنە » دەوتریت « وولاتی کوردستان » ووشەی کوردستان مانای وولاتی کوردەکانە کە ناوچەیەکی زور پانو فراوانە ، ئەم ووشەیە « سنجار[1] » دوا پاشای « سلجوق » ی یەکان بری بە سەر ناوچەکانی وولاتەکەیا ، لە چەرخی دوانزەهەم پ ز دا ئەم خاکە پیك هاتبو لە چەند وولاتیك ریزە شاخەکانی « زاگروس » ا یەکی جیا دەکردنەوە ، لە رۆژ هەلاتی ئەم ریزە شاخەدا وولاتی « هەمەدانو دەپیور کرمانشاهان » هەبو ، لە رۆژ ئاوایا وولاتی « شارەزورو سنجار » •

یەکەم میژوو نووس کە ووشەی کوردستانی نوسیوە لە پەرتووکی « نزهة القلوب » دا لە سالی « ٧٤٠ » ك لە چەرخی چواردەهەما « قەزوینی » بو ، لە کوتایی چەرخی حەڤدەهەما عوسمانیەکان ناوی وولاتیك لە وولاتەکانی خویاز « کوردستانی تورکیا » کە پیك هاتبو لە لوای « دەرسیمو موشو دیاز بەکر زانای فرنسی « کیەە » لە مەوسوعەکەیا دەربارەی « کوردستان » نوسیویەتی ئەلیت : ــ « کوردستان یان وولاتی کوردەکان ناوچەیەکە دریژ بوتەوە لە خواروی روژهەلاتی تورکیای ئاسیاوە تا سنوری عیراقو ئیرانوووولاتی کاردو-

[1] سلطان سنجر = یا سولتان سنجە ر [illegible]

جارانی پێ دەلێن » شارەکانی لە تورکیادا « دیار بەکر » لە عیراقدا « موصـــل »
لە ئیراندا « ئورمـــێ » ن •
وە دیسانەوە مەوسوعەکە باسی کوردستان ئەکاو ئەلیت : ــ لە ناوچەیەکا لــە
بەکیەتی سوڤیت لە کوماری « ئازربایجان » دا کورد هەیە ، پانایی ئەو خــاکەی
تیایا دەژین « ٣٥٣٤٠ » کەی چوار گوشەکە « ٥١،٥٠٠ » کەسی تیادەژین پایتەختەکەیان
« لاچـــــین » ە « ١ » •

استاذ فائق السامرائی لە پەرتووکی « القضیه الکردیه » دا ئەلیت « کوردستان
بە هەمو مانایەکی فراوانی ئەو ووشەیەوە بەو وولاتە ئەلێن کە هەمو کوردەکانی
تیا جێ نشینن ، بێ جیاوازی وەك یەك ئەم وولاتەش دابەش کراوە بە ســـەر
« عیراق و ئیران و تورکیاو سوریاو یەکیەتـــی سوڤیـــت » دا لە مـــەوسوعەکەی
« لاروس » « ١ » دا بە فەرەنسی ئەلێت « کوردستان وولاتیکی ئاســـیاییە
دابەش بوە لە بەینی « تورکیاو عیراق و فارس و سوریە » دا
« ل • هـ • فلورنس » لە پەرتووکی « الاجناس » ( ٢ ) دا ئەلێت « وولاتی
کوردستان ناوچەیەکی دەشتایی و شاخاویە دابەش بوە لە بەینی « تورکیاو عیراق و
ئیران » دا لە گەڵ چەند مستعمرەیەك لە قەوقاس وە سەربەرەو خواریەکانی شاخی
ئەرمینیای سوڤیتی •

---

قاسم والاکـراد صـــص ٢٩
قاسم والاکـراد صــص ١٩
« ١ » قاسم و لاکراد « خناجر وجبال » احمد فوزی ص ١٠ ــ ٢١
« ٢ » قاسم والاکراد ــ خناجر وجبال ــ احمد فوزی ص
« ٣ » کردستان والاکراد دراسة سیاسیه واقتصادیه دکتور عبدالرحمن قاسملو

مەوسوعەی عەرەبی « ١ » ... : ـ کوردەکان نەتەوەیەکی « ئاریـــن » مسولمانن نیشتمانیان کوردستانە ، وە ئەڵێت کوردســتان ناوچەیەکی شــاخاویە کەوتوتە خواروی شاخی ئاراراتەوە سیاسەت پارچە پارچەی کــردوە لە بــەینی « عیراق و ئیران و تورکیا دا » کەشتکەرو گەروکی تورکی « اولیا چەلەبی » « ٢ » کە لە چەرخی حەڤدەهەما ناوبانگی دەرکرد ، لە دوای گەشت و گەرانی بە هەموو ناوچەکانی کوردستانا ئەڵێت : « وولاتی ئەرزو رۆم و وان و هەکاری و دیاربەکرو جزیرەو عمادیەو موصل و شارەزورو ئەردەلان » هەموی وولاتی کوردستانە کەبە حەڤدە قۆناغ یعنی حەڤدە رۆژ دەبررێت •

فەرهەنگی جغرافی « ابن عمران » « ١ » لە بەشی پینجەمیا کە بە زمانی فارسی نوسراوە ئەڵێت : ـ کوردستان بەشی روژئاوای ئیرانە کوردەکانی تیا جێ نشینن سنوری کوردستان بە ئاسانی نەخشەی ناکیشریت ،وە هەروەها ناتوانین هێلێك دابنین بو هەموو کوردستان ، بەلام لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو دەرس کردنی ئەو ناوچەیە کە کوردی تیا جێ نشینە ، لە رۆژی مێژووی خاکەوە ، ئەتوانری بــە شێوەیەکی ... لە راستی سنو ... دابنرێت ، هێلیکی راست رابکیشریــت لــە لوتکەی شاخی ئاراراتەوە لە ژورووی رۆژهەلاتا ، سەرەو خوار بێتەوە ســەرەو بەشی خواروی لە « زاگروس » ... « پشــتکوە »وە لەویشەوە هیلکیــی راست رابکشین بەرەو رۆژ ئاوا تا موصل لە عیراقدا ، ئنجا هێلێکی تری راســت راکشین بەرەو رۆژ ئاوا ... لە موصلەوە تا دەگاتە ناوچەکانی تورکیا لە لــوای

« ئەسکەندەرونە » ەوە ، لەویشەوە هێلێکی تر رابکیشرێــت بــەرەو ژووروی رۆژ هەلاّت تا ئەرەزورۆم لە تورکیا ، ئنجا لە ئەرزو رۆمەوە هێلێکی تر رابکیشین بەرەو روژ هەلاّت تا لووتکەی « ئارارات » « ۱ » بەم جورە مســاحەی خــاکی وولاّتی کوردستان دەردەکەوی کە « ٤٠٩ ، ٦٥٠ » کم‌ی چوار گوشەیە کە پاترو فراوانترە لە هەموو خاکی بەریتانیاو هولەندەو بەلچیکاو سویسرەو دانیمــارك ، ئەم خاکە پان‌و فراوانە دابەش بوە بەم جورە : ــ

لە تورکیا «١٩٤،٤٠٠» کم‌ی چوار گوشەلە ئیران «١٢٤،٩٥٠» کم‌ی چوار گوشەیە لە عیراق «٧٢،٠٠٠» کم‌ی چوار گوشەیە لەسوریە «١٨،٣٠٠» کم‌ی چوار گوشەیەوە دریژایی کوردستان لە ژورووەوە بو خوارو « ٦٠٠٠ » کم بەرە بەرە زیاد ئەکــا تا دەگــاتە « ٧٥٠ » کم‌ی چوار گوشەیە .

★ ★ ★

---

« ۱ » کردستان والاکراد دراسە اقتصادیە وسیاسیە د . قاسملو

« ۲ » کردسنان والاکراد د . قاسملو

* مەوسوعەی بەریتانیا ئەلیت دریژایی کوردستان ٦٠٠ میلە وە پانایی ١٥٠ میلە کەچی قاموس العالم دەری خستوە کە دریژایی کوردستان ٩٠٠ کــم وە پانایی ١٠٠ تا ٢٠٠ کم بەشی « ٥ » قاموس العالم ص ٣٨٤٠

## رەگـــەزی کـــورد:ـ

کورد لە خاوینترین ڕەگەزی نەتەوەکانی رۆژ هەڵاتی ناوەراستە کە دانراوە با
ڵانکەی پێشکەوتنی کون . هیشتا مێژووی کورد بە تەواوەتی روون نـەبوتەو
بویە میژوو نوسانبە پیی ئارەزوو مەبەستی خـویان چونیـان نوسـی بـو
نووسیویانە ،مەبەستی بەرو دوایان ئەوە بووەکە بگەنە ئەو ئامانجەی ئەونوسینو
مێژوەی بو دەنوسن ، ئیتر وجدانیان خستوتە لاوە یان نەیان خستووەو راستیاز
کردوە بە ژیر لیوەوە وە یان نەیان کردوە جیایە ، بەلام زوربەی نوسینەکانیان تاکا
تاکەیان نەبێت هەموی دوورن لە راستیو هیچ بەلگەو سەرچاوەیەکی مێـژوویاز
نەبووە . وە بەلگەی مێژوویان بە دەســتەوە نەبووە کە راســتی نوسـینەکانیاز
دەرخەنو پیشان بدەن ، هەندیکیان ووتویانە کوردەکان « سامین » یان«تورکن»
هەندیکی تریشیان لە بەر ئەوەی زبانی کوردی نزیکە لە زبانی « فارســی » یەو
ووتوویانە کوردەکان ئیرانینو فارسن ، بەم جۆرە بریاریکی تەواویان نەداوە کـ
کورد خوی نەتەوەیەو جیاوازە لە نەتەوەکانی تر ، وە پێشــکەوتنی مێـژوویاز
دەســتکاری کــردووەو شــیواندویانە .

بەلام ئیستا بە بەلگەی میژوو دەرکەوتووە کە کوردەکان « ئاریـــن » وە لـ
رەگــەزی خیلەکانی « زاگروســـ » ن .

روژهەلات شوناسی ناسراو « مینورسکی » ئەلیت : ـ « رەنگـە نـەتەوەی
کورد لە سەرەتادا لە رۆژهەلاتەوە ( روژهەلاتی ئیران ) کوچی کردبی بو روژئاو
( کوردستانی ئیستا ) وە لە سەرەتای روژی هەلهاتن روژی مێژوەوە لەو ناوچەیەد
نیشتە جی بوبن » ئەگونجی لە پێشش هاتنی ئەم نـەتەوەیە بو ئەم شـوینە لـ

کوردستانی ناوەراستەوە نەتەوەی تر لەم شوینەدا نیشتەجی بوبن هەر بەم ناوەوە یان بە ناوی ترەوە کە نزیك بن لە ناوی ئەو نەتەوانەو تیکەلیان بوبن‌و پـی‌یانەوە لکابن بە جوریکی وا بوبنە یەك نەتەوە بە دریژایی زروف‌و زەمان •
زور لە پزیشکە شارەزاکان‌و باحثەکانی تریشس بیرو باوری « مینورسکی »«۱»
پەسەند ئەکەن لە بابەت سەرەتاو رەگەزی کـــوردەوە •

## ۱ :ــ چینی یەکەمی رەگەزی کورد :ــ

نەتەوە کونەکانی « زاگروسن » کە ریـــزە شاخیکـــە لە بەشـــی خـــواروی شـــــاخـــی « ئـــــارارات » •

أ : ــ لۆلـــۆ یـــان لولوبـــوم : ــ

ئەم نەتەوەیە لە ناوچەی شارەزوردا نیشتەجی بوون ، بەلام بـــە تـــەواوی نازانریت کەی هاتونەتە ئەوشوینە ، بو یەکەم جار لە گەڵ سوپاکانی ئاشوریەکانا لە چەرخی سیانزەهەمی پ • زدا لە یەکیان داوە •

پرۆفیسور « سپایزەر » ئەڵێت لۆلۆیی‌یەکان باپیرە گەورەی لورەکانی ئیستان ، وە بەلگە کونەکانی ئاشوریەکان ئەلین ، وولاتی لۆلۆ زور وولاتیکی پیشکەوتو ئـــــاوەدان بـــــووە •

---

« ۱ » مینوـسکی میژوو نووس وە روژهەلات شوناسیکی ـوڤیتی‌یە

ب : ـ گۆتی یان جودی : ـ

نەتەوەیەکی بەناو بانگە لە نەتەوەکانی « زاگروس » وولاتی « ئاکاد » (سومەر
یان داگیر کرد لە « ٢٦٤٩ »پ زدا وە ماوەی « ١٢٥ » سال حکمرانیان کـردوو
لە لیستەی ناوی پاشاکانا کە دۆزراوەتەوە لە ( نیپور ) ناوی « ٢١ » پاشای گوت
تیایە ، وا دەردەکەوێ حکومەتی گوتی وولاتەکەی خۆی بەجێ هێشتوەو هاتو
حکمرانی وولاتی « ئاکادو سومەر » یان کردوە وەك وولاتێکی داگـیر کـر
( مستعمرە ) ، پاشا بە دەسەلاتەکانی « لەگش » ناچـار بون سـەر بـو ئـا
( گوتی ) یانە دابنەوینن کە دوا پاشایان ناوی « بریکان » بوو •

لە چەرخـی شانزە هـەمدا لە « ٢٥٢٤ » ی پ ز پاشای « اور » حـکومە
( گوتی ) یەکانی لە ناو برد لە ئاکاد عەشایەرەکانی ئەم نەتەوەیە ناچار بوون بـ
گەرانەوە بو ناو شاخەکانی « زاگروس » تا لەویـدا بەرگری بکـەن • نـاو
گوتیەکان بو جاری دووەم لە چەرخی سیانزەهەمی پ ز دا هاتوە لەو شـەرانە
کە لە گەل ئاشوریەکانا کردویانە ، لە مێژووی « گوتی » دا ئالو گۆر هەیە لـ
تێوان ئەم ووشەیەو ووشەی « کۆرتی » دا وا دەردەکەوی ئەم دوو ووشەیە یـ
بن و ناوی نەتەوەیەك بـن •

رۆژ هەلات شوناس « دریڤر » « ١ » لە پەرتووکەکەیا ( پـەیوەندی زبانـ
ووشەی کورد ) دا ئەلێت ووشەی « کوزیوی » زۆر گرنگە لەباسکردنی رەگەز
جێ نشینانی کوردستانا وە ئەلێت ووشەی « کاردا یان کاردوخی و کۆتوخـو
کوردی و کارداك و سیرنی و گودیای و کوردئین و کاردوو کارداوایە • • هەتـد

---

« ١ » الرابطة اللغویە للفظ کرد

هەموو ئەگەرینەوە سەر رەگەزێك لە گەل ئەوەشا کە لە ووشـەو قسـە کـردنا جیاوازیان هەیە •

ج : ــ کاسای یان کۆسی یان کۆشـو : ــ

نەتەوەیەکە لە نەتەوەکانی « زاگروس » لە سەرەتادا لە ناوچەی « کرمانشا »دا نیشتەجێ بوون ، ئەمانە کۆچەری نەبون بەڵکو نیشتە جێی ئەصلی بوون رویان کردە رۆژ هەڵاتی « بابل » ئاکادیەکان پێیان دەوتن « کاشو » ئەمانە ناویان لـە پەرتووکی پیرۆز « الکتاب المقدس »« ئینجیل »دا هەیە پێیان دەوتری «کوش»

د : ــ خالدی کالدی یان وارتـو : ــ

وا زانراوە کە ئەم نەتەوەیە لە کاتێکی نەزانراوا لە رۆژهەڵاتی ئاسیای بچوکەوە هاتونەتە ناوچەی گۆلی « وان » بە پێی داستانەکانی ئاشوریەکان وە بە پـێی بەڵگە کۆنە دوزراوەکان کە تایبەتی شەرەکانی « سەرجون »ی دووەم پاشـای ئاشوریەکانە ئەڵێت : ــ سنوری حکومەتی « خالدی ــ کالدی » لە کاتێکا لـە بەشی ژوورەوە تا گۆلی « گوگجە » وە « ئەسکەندەر پول » لە قەفقاس وە لـە رۆژ ئاواوە تا روباری « فرات » وە لە خوارەوە تا « رەواندوز » و ئاوی (زاب) وە لە رۆژهەڵاتەوە تا گۆلی « ورمی » بوە وە بو ماوەیەك لە سوریاشدا حکمرانی کردوە ، پایتەختی ئەم حکومەتە شاری « توسپاس » بوە کە « وان » ی ئیستایە یەکەم پاشای خالدیەکان ناوی « ساردوریس » بوە لە « ٨٤٠ » پ ز دا لەناوچوە

★★★

## ٢ :ـ چینی دووەم لە رەگەزی کورد :ـ

### ا :ـ میـــــدیـەکـان :ـ

بەلگە تاریخیەکانی چەرخی حەوتەم و هەشتەم و نویەمی پ ز زەمانی ئاشوریەکان دەری دەخا کە گۆرینیك لە روژهەلاتی کوردستانا رویداوە بەهۆی کۆچ کردنی نەتەوە « ئاری » یەکانەوە « هیندو ئەوروپی » لە رۆژهەلاتی دەریای ( قەزوین تا وولاتی میدیا ( روژهەلاتی کوردستان ) یان ژوروی رۆژئاوای ئیران ، یەکەم کەس کە ناوی « میدیا »ی هیناوە پاشای ئاشوری « شەلما نەسری » پینجەم بو وە لە سالی ٨٢٣ ــ ١٨٠ پ ز ئەم میدیانە لە دوای ئەم تاریخە بونە هۆی تەنك چەلەمەو هەرەشەیان لە حکومەتی ئاشوری دەکرد لە هەموو کاتیکا • یەکەمجار ناوچەی روژهەلاتی وولاتی میدیایان داگیر کرد بە داهاتنـی چـەرخی حـەوتە دەسەلاتی ئەم « میدیا » ی یانە کشا بە سەر هەموو وولاتا کە لە دواییدا ناوی نر وولاتی « میدیا » وە نەتەوەی ( پارساى ) یش کـەوتە ژیر دەسـتیانەوە کـ دراوسییان بوون و بە خزمایەتیش دەگەیشتنە یەك ، ئنجا شـاری « ئـەقباتانـ هەمەدان » ئ ستایان بنا کردو کردیان بە پایتەختی حکومەتەکەیان •

لە سالی « ٦٢٥ » پ ز شا ( نەبو پولاسەر ) ی ئاشوری کە سەربەخویـی ا شاری بابل دا بلاو کردەوە لەگەل « میدیا » یی یەکان « سە شی »یەکانا دوستایەتی گرت لە دژ حکومەتی « نەینوا ــ نینوی »وە لە ناوی برد وە شاری « نەینەوای وێران کرد لە سالی ٦١٢ پ ز « کەی ئەخسار ــ کەیخسرەو »شای میدیا حکومەتی ئاشوری لە ناوبرد بەم جورە بناغەی ئیمپراتوریەتی « میدیا »ی دامەزراند ، زۆ پیشکەوتو گەشەی کرد ، سنووری هەر لە ( بوخارا ) وە تا روژهەلاتی روبار

« قزل ئیرماق » وه له دەریای « قەزوین » ەوه له بەشی ژوورودا تا خلیجی فارس له بەشی خوارودا ، ئەم ئیمپراتوریەتە گەورەیە لە سالی ٥٥٠ پ ز کە شاکەی ناوی « ئیستیاغ ئیخویکو » بو شای « ئەخمینی » « کورس » بو له ناوی برد .

پەرتووکی « ئیرانی کۆن » نوسەری « مشیر الدوله » له لاپەرە ( ٥٧ ) دا ئەلێت زبانی ( مبدیا ) یی یان عەرەبو زبانەیە کە نەتەوەی کورد ئیستا قسەی پێ دەکەن ، یان هیچ نەبی بناغەی ئەو زبانەیە .

بەم بونەوەو بە بونەی نیشتمان خوینەوه نەتەوەی « میدیا » به ڕەگەزی نەسلی نەتەوەی کورد دادەنریت .

ب : ــ نایری ــ نەهری : ــ

ئەم نەتەوەیە له پێش کۆچی نەتەوەکانا له دوا یدا له کوردستانا نیشتەجێ بوونه له زەمانی حکومەتی ئاشوریەکانا ناویان هاتوه .

« میجەر سون » ئەلێت نەتەوەی نایری له کوردستانی ناوەراستا ئەژین ، لە نێوەندی چەرخی دوانزەهەمو پانزەهەمی پ ز دا ، ئەم نەتەوەیە له کاتی خویدا زۆر ئازاو چالاك بوه « ئاشوری »یەکان شەری زوریان له گەڵ کردون ، ئەلێن ئەو دیهاتانەو ئەو عەشایەرانەی که ئیستا له ناوچەی « نەهری » و « شەمدینان » دان پاشماوەی ئەو نەتەوە کۆنەن .

ج : ــ کاردوخی : ــ

دوو باس هەیە دەربارەی ئەم نەتەوەیە کە نوشی « گزینفون » هاتن له کاتی

گەرانەوەی دەهەزار سەربازە یونانیەکاندا لەئیرانەوە بۆیونانلە سالی ٤٠١ی پ ز دا

باسی یەکەم : ـ ووشەی « کاردوخی » ناوێکی گۆڕراوو هەلگەڕاوەیە لە ووشەی « گوتی » کە نەتەوەیەکی کۆنە لە « چینی یەکەم » بە پێی زەمانەو رۆژ ووشـــە کە گۆڕراوە •

باسی دووەم : ــ نەتەوەی کاردوخی رەنگە هاتبنە وولاتی کوردستانو تیـا نیشتەجێ بوبن لە کاتیکا « میدیـا »یـی‌یەکان وە « فارســـ » ەکان هاتنــە نیشتمانەکەیانو تیا نیشتەجێ بوون • وە یان لە ناوەراستـی چەرخی حـەوتەمی پ ز داو لە دوایی‌دا زال بوون بە سەر عەشایەرو نەتەوەکانی کوردستانا وە تێکەل بە هەموویان بونو پێیانەوە لکان ، بە پێی « باسی یەکەم »ئەم نەتەوەیە یەکێکە لە نەتەوەکانی « زاگروس »ی کون ، وە بە پێی « باســی دووەم » یەکێکە لە نەتەوەی ( ئاری ــ هیندو ئەوروپی ) •

« کزینفون » لە پەرتووکی « ئەناباسیس »یدا ئەلێت ، نیشتمانەکەیان درێــژە دەکێشێ تا دەگاتە « بۆتان » ، سەریان بو کەس دا نەنەواندوەو لە ژێر دەسەلاتی کەسا نەبون ، تەنانەت سەریان دا نەنەواندوە بۆ دەولەتی « ئەردە شـێر » واتــە دەولەتی « فارس »کان وە دەولەتی « ئەرمەنی »یەکان لە ژێر دەسەلاتیانا نەبون وە ووتویەتی ئەو دەردە ، سەرێ‌یەی کە هاتوتە رێیان بە دەست کاردوخی‌یەکانەوە نەیان دیوە لە سوپا گەورەکانــی « فارس »یشــ کــاردوخی‌یەکان ســوپای « کزینفون »یان ئابلوقە دابو لە نزیك دەربەندی « بازیان » کە ئەکەوێتە نیــوان ( چەمچەمال ) و « سولەیمانی » ئیستاوە ، ئەم نەتەوەیە لەو نەتەوانەیە کە ئەسلی کوردن وە سەربە خۆیی خۆیان پاراستوە بە درێژایی چەرخەکان •

## بو یەکەمجار ناو بردنی کـورد :ـ

سیر « سدنی ببمیث » ئەلێت : لە کاتی لە ناو چونی حکومەتی ئاشـوریەکاناو لەوە پێشیش زور جار ناوی کورد براوە ، مستر « هۆل » لە پەرتووکی «مێژووی رۆژهەلاتی دور »یدا لە لاپەرە ( ٥١١ )دا ئەلێت « ئاشور ناسـر پـال » کە دوا پاشای ئاشور بوە ، هێرشێکی بردۆتە سەر شای ( مانس ) بو ئەوەی سەری پێ دابنەوینی بەلام سەر نەکەوتوەو دەرەقەتی کوردە ئازاو چالاکەکان نەهاتـوە لە سالی ٦٤٦ پ ز دا « سمیث » ئەم کوردانەی داناوە بەو « کاردوخی »یانەی کـە « کزینفون » ناوی بردون لە پەرتووکی « ئەنا باسیس »یدا •

کورتەی قسە لەم باسەوە ئەوەیە کە دوو باسی زور لە یەکتـر نزیـك هـەن دەربارەی رەگەزی کـــورد : ــ

یەکەمیان : ــ کورد لە رەگەزی نەتەوەکانی « زاگروس »ن « لۆلۆ گوتی ، کاسای ، خالدی ، سوپاری » کە ئەمانە قفقاسین لە ئەسـلا ، وەك هەندیـك لە رۆژهەلات شوناسەکان باوریان وایە گۆڕراون بە « ئاری » لە ژێر تاثیری لافاوی کوچەریەکانا کە رویداوە لە چەرخی هەشتو نوی پ ز دا •

« میدیایی و کاردوخیو کورد لە نەتەوەو رگەزی ئەمهەموو نەتەوانەن بە تومەل

دووەمیان : ــ کورد لە رەگەزی « ئاری ــ هیندو ــ ئەوروپی » تـەواون واتە « میدیا » یو « کاردوخـــی »ن ، ئەم باسە زور لـــە مێـــژوو نووســـانو شارەزایانو پزیشکەکانی مێژووتأییـــدی ئەکەن •

نەتەوەکانی جیهان بە زۆری « کورد »ەکانیان بە ناوی جیاواز ناو بردوە ، بەلام

لەم دوو باسەی سەرەوە هەر کامیان راست بیت بە هەموو جورێك دەردەکەویت کە « کورد » نەتەوەیەکی رەسەنەو زور کونەو زور روشن بیرو پێشکەوتو بوەو زوریشی لە دەمیکەوە لە نیشتمانی ئیستای دا نیشتە جی بووە.

★ ★ ★

## بزوتنەوەی ســیاسی نەتەوەی کورد :ـ

بە پیی باری سیاسیو چاو چنوکی دەولەتە ئیمپریالیزمە بە هیچ تێر نەبوەکان ئارەزوی دلیان ، وە بەهوی پیریو زەبونیو پەك کەوتەیی ئیمپرانوریەتی گەورەی « عوسمانی » ئەم دەولەتە زلە خاك فراوانە لاکەوتەیە پارچە پارچە کراو لەت کوت کراو خاکەکەی دابەش کرا لە بەینی سویند خوازانا ، نەتەوەکان کە لە ژێر ئالای ئەم دەولەتەدا دەژیان ، یەك لە دوای یەك بوون بە مکروبو رەگو گوولی دایان لە لەشی زلو زەبەلاحیو دایان وەشاندو رزاندیان ، بە تایبەتی نەتەوەکانی نیوە دورگەی « بالقان » لە چەرخی نوزدەهەما وەك « یونانو صربو بولغاریاو بوسنەو ئەلبانو فلاکیە » هەموو دەستیان کرد بە روتنەوەو جولانەو وە تێکوشان بو خو رزگار کردن لە ژێر دەسەلاتی « عوسمانی »و ژیان بە سەربەخویی ، وە لە چەرخی بیستەما لە نیوە دورگەی عەرەبو ئەرمینیا کوردستانا ، تا لە ناو جەرگەی تورکیاشا دەست کرا بە بزوتنەوە ، ئەم دەولەتە گەورەیە « عوسمانی » پارچە پارچە کرا لە هەموو شوینیکا دەولەتیکی نەتەوایەتی

تازه پیك هاتو دامەزرا ، تەنیا لە کوردستانا نەبی هیچ نەکرا ، لە جیاتی ئەوەی رزگاربیو ببێ بە دەولەتو سەربەخۆیی دەست نەوی لەچی خاکەکەشی دابەش کرا ، بەشی ژوروی بە دەست تورکیاوە مایەوە ، بەشی خوارووشــی کە ولایەتــی موصلو دەورو پشتیەتی لە سالی ١٩٢٥ دا درایە بەریتانیــا ، لــە دوای بگــرەو بەردەیەکی سیاسی زورئەم بەشەی کوردستانیش خەلات کرا بە شا « فیصل »ی شای عیراق وە لە گەل بەغدادو بەسرەدا لێکدران بو ئەوەی عراقیکی تازەی لــێ پێك بیت . ئەم خاکە رەنگینە وەك هێلکەیەکی پاك کراو بەریتانیای تاوان بــارو خالەبار بەخشی بە کوری شەریفی مکە واتە بە « فیصل » لە کاتی دەسەلاتــداری عوسمانیەکانا لەم ناوچەیەدا ژیانیکی ئاینیو سیاسی بە ناوا بلاو بوبووە . بابەتی نەتەوایەتیو رەگەزایەتیو وولات پەروەری نەبو لە ناواو بە یادی کەسدا نەدەهات چونکە زەنگی ســەربەخوییو دیموکراتیەتو مافی نەتەوایەتی کە لیدراو دەنگی زرەنگاەوەو بلاو بووە بەهەموو جهانا پاشش‌شورشی فرنسەئەم دەنگەنەگەیشتبوە بەر گویی ئەو نەتەوانەی کە لە ژێر ئالای عوسمانیدا دەژیان وە دەنگو باســـی شورشی گەورەی فەرەنسەو روخاندنی « باستیل » بە تەواوی روون نەبوبۆوە . وە ئەو نەتەوانە لە خرپەی خەوا بوون ، چونکە زۆربەی ئەو نەتەوانەی لە ژێــر ئالای عوسمانیدا دەژیان موسلمان بون وە پاشایان دانابو بە خەلیفەی ئیسلام وە بیریان لە جیاوازی نەتەوایەتیو رەگەزایەتی نەکردبووە لە بەر ئەوە دلسوزانــە خزمەتی دەولەتی عوسمانیان دەکرد . بەلام نەتەوە « دیان »ەکان « مسیحی » لەم ژیانی ئاینیە دور بون ، بە بونەی جیاوازی ئاینیانەوە تەنیا پەیوەندی سیاســیان هەبوو بەم دەولەتەوە ، وە خلیفەشــس خوی زور رقی لە بابــەتی نــەتەوایەتیو رەگەزایەتی بو رقی لە جیاوازی بو تەنانەت رقی لە جیاوازی تورکیش بو بونــە

ئەم سیاسەتەی خنیفەی ئیسلام بوبوە هوی ئەوەی کە نەتەوەکانی تریش بیر لـ
نەتەوایەتی‌و مافی نەتەوایەتی خویان بکەنەوە لە مسولمانەتی بەولاوە ، تا ئـەو
رۆژەی ئەم پەتی پەیوەندی ئایین پەروەریە پسێنرا لە لایەن « ژۆن تورك » لاو
تازە پێ گەیشتوە روشن بیرەکانی تورکەوە وە لەسەرەتای چەرخی بیستەمامصطفی
کمال خلافەتی نەهیشت ، بزوتنی دەماری رەگەزایەتی لە ناو نەتەوە تورکەکانا بو
هۆی راچلەکاندنی نەتەوەکانی تر کە تورك نین ، وە بوە هۆی بزواندنو گـــر
کردنی دەماری نەتەوایەتیان ، بویە باشی دەکەویتە بـەر چـاو کە بـزوتنەوەی
کوردەکان لە گەڵ بزوتنەوەی نەتەوەی عەرەبدا بەو کاتەوە دەست پێ دەکا کـ
دەکەویتە کوتایی چەرخی نوزدەهەم‌و سەرەتای چەرخی بیستەوە ، ئەم بزوتنـو
دەمارو نەتەوایەتی‌یە لە سەرەتادا بزوتنەوەیەکی روشن بیری بو •

بزوسەوەی نەتەوە موسلمانەکان لەم کاتەدا زور دوانەوتو تر بو لە بزوتنەوەی
نەتەوە دیانەکان « مسیحی » چونکە ئایین تأثیری گەورەی هەبو یەکیەتی‌و برایەتی
ئیسلام‌و برای دینی دەستی بالای هەبو لـەم دواکەوتنـەدا بە تایبەتـی لە نـاو
کوردەواریدا کەتا ئەمروش هەر ماوەو بوەبە گورزیکی گران بولە خشتە بردن
هەڵ خەڵەتاندنمان لە لایەن دوژمنەکانمانەوە کە بە ناوی ئیسلامیەت‌و بە نـــاوی
برای دینیەوە ئەمان کەن بە گژ یەکاو بە هەمو توانایانەوە لێمان ئەدەن‌و هـــەوڵ
ئەدەن بو لە ناوبردنمان ، کە ئەم باور کردنەمان بە دوژمن هەمووی هوی ئەوەی
کە بە برای دینی خومانیان دەزانین‌و ئەڵێن مسوڵمانن ، بویە ئەم باور کـــردنەمان
بۆتە هۆی مایە پوچی‌و نە ئەیشتنمان بە ئامانجی بەرزی چاوەرێ کراومان جا ئە
یەکیەتی‌و برایەتی ئیسلامە نەك تەنیا کورد بەلکو عەرەبیشـــی زور دوا خســـ
تەماشاکەن « یونان » یان دەوڵەتەکانی تری « بالقان » بەو ن لە پێشتر گەیشتـــو

به ئامانجی سیاسیان ، وه بزوتنه‌وه‌ی نه‌ته‌وه دیانه‌کان « مسیحی » زووتر گۆڕرا به بزوتنه‌وه‌ی سیاسی‌و داوا کردنی مافی نه‌ته‌وایه‌تی‌و ئـازادی‌و سـه‌ربه‌خویی که‌چی بزوتنه‌وه‌ی عه‌ره‌ب کوردو مسولمانه‌کانی تر دوا که‌وت ، چونکه له یه‌که‌م هه‌نگاویانا بیریان له سه‌ربه‌خویی وولاته‌که‌یان نه‌کردەوه‌و بیریان له‌وه نه‌کردوه که له « عوسمانی » یه‌کان جیا بنه‌وه‌و خویان سه‌ربه‌خوبن ، بو ده‌رخستنی راستی ئه‌م قسه‌یه ، له کاتیکا مصطفی کمال له گه‌ل یونانیه‌کانا که‌وته شه‌ره‌وه‌و تورکیا لـه روخان‌و گیانه‌لاوا بو وه ئه‌م زروفه باشترین هه‌ل بو بو نه‌ته‌وه‌ی کورد که سودی لی وه‌رگری بو خو رزگار کردن‌و سـه‌ندنی مـافی نه‌ته‌وایه‌تـی‌و چه‌سپاندنـی به‌نده‌کانی په‌یمانی « سیڤر » ، یه‌کیك له ئه‌ندامانی حزبی « هیوا » ( ممدوح سلیم) ک- له تورکیا بووه له گه‌ل چه‌ند ئه‌ندامیکی تردا چونه‌ته لای شیخ عبـدالقادری نهری « شمدینانی » که له‌و کاته‌دا سه‌روکی حزبی هیوا بوه‌وجله‌وی هه‌لسوراندنی کاروباری سیاسی کوردو بزوتنه‌وه‌و رزگاری کوردی به ده‌ست بووه پی‌یان وتوه لاوه‌کانی حزب وا به باشی ده‌زانن که کورد له زروفی شه‌ری یونان‌و تورك سوود وه‌رگری چونکه تورکیا زور زه‌بونه ، بویه ئه‌بی کورد به زوترین کات ده‌سـتی خوی بیه‌شینی له‌م روژه‌دا باشترین هه‌له بۆی هه‌لکه‌وتوه که مافی نه‌ته‌وایه‌تـی خوی بسێنی ، شیخ عبدالقادری نهری وه‌لامی داونه‌ته‌وه‌و وتویه‌تی : ــ « نـابی ئێمه له‌م وه‌خته‌دا له تورك بده‌ین چونکه ئیسلامه » • وتویه‌تی « ئه‌گه‌ر من ئێستا هه‌لسم وه له‌م کاته‌دا له‌م زه‌بونیه‌دا له تورك بده‌م باپیرم « جد » که پێغـه‌مبه‌ره له‌عنه‌تـم لـی ده‌کا » •

به‌م عقلیه‌ته‌وه ئیشیان کردوه بویه تا ئه‌مرو نه‌گه‌یشتون به ئامانج •

باری سیاسی دەولەتانیش هێشتا ڕێی نەداوەو هەل هەلنەکەوتوە بو نەتەوەی کورد وەك هەلکەوت بو نەتەوەکانی تری روژ هەلاتی ناوەراست ، کەچی لە گەل ئەمەشا نەتەوەی کورد لە «٥٠»سال زیاترە بزوتوتەوەو خەریکی خەباتەو هەولو تەقەلای بێ پشوو ئەدا بو سەندنی مافی نەتەوایەتی ، بەم پێیە مێژووی تازەی کوردستان پێك هاتوە لە بزوتنەوەو جولانەوەو راچەنینو هەلمەتو شورش بەو بونەیەوە هەمیشە لە ژێر باری گرانی بومبا بارانو محاکەماتو سزاو ئەشکەنجەو بەندیدا ژیاوە ، کورد قوربانی زوری داوە لەم ڕێگایانەدا ، ئەمە دوو چەرخە هێشتا کورد نەگەیشتوە بە ئامانج ، ئەو بەلێنانەی کە سویند خوارانی لە وەختی خویا لە پەیمانی « سیفر »دا دایان بە کوردەکان لە روژی ١٠ی ئابی ١٩٢٠دا بە هیچ دەرچوو . چونکە لە سالی ١٩٢٣دا پەیمانی « لوزان » بوە هیزیکی تازە لە بەینی تورکەکانو سویند خوارانیدا لە دوای جەنگی ئازادی تورك . پەیمانی لوزان بەلینیکی قانونیو دبلوماسی بو دراو کرا بە چەکیکی کوشندەو برەر درایە دەست مصطفی کمال بو کوشتنی کورد وە بەتال کردنەوەی پەیمانی « سیفر » بەریتانیاو سویند خواران بو دل نەوایی کردنی مصطفی کمال ئەم پاشقولەشیاز لە کورد گرت ، جا بویە بومان دەرکەوت کە کیشەی کورد شتیکی خەیالی نیەو داستانو ئەفسانە نیە کە روژنامە نوسان یان روژهەلاتی شوناسە بیگانەکان یاز مێژو نوسان وەك لەوە پیش بە ئارەزوی دلی خویان لە سەریان نوسیوە ، یاز وەك هەندی لە دەولەتە روژ هەلاتیەکانی ناوەراست بە یادیانا هاتوەو دیت ، یاز وەك بیرو باوەری گیلانەی هەندی لە کاربەدەستانی دەولەتان کە گالتەیاز بەم کیشەیە هاتوەو دیت ، کیشەی کورد بابەتیکە لەمانە زور قولتر کیشەی کورد هەیە ، چونکە کوردەکان هەست بە کوردایەتی ئەکەن وە بە کوردی دەژینو

شانازی به نەتەوەکەیانو زبانەکەیانو ولاتەکەیانەوە دەکەن هیز نیە لە جیهانا وە لە سەر زەمینا بتوانی ئەم هەستو بیرو باوەری کوردایەتیە نەهێلیت ، یان کزی بکات ، یان بی‌توینیتەوە ، ئەوەی شایانی داخە ئەوەیە کە هەندی کاربەدەستانی گێلوکە هەن لە هەندی دەولەتانا کە پەیوەندیان هەیە بە کیشەی کوردەوە ، خویان هەلە دەکەنو خویان گێل دەکەن دان نانین بە بونی کوردو کیشەی کوردا بویە ئیمە لیرەدا ئەتوانین ئەم بابەتە بە دوو ووشەی کورت بخەینە بەر چاو ، وە بە هەمو کەسیکی ژیرو خاوەن بیرو باوریکی راستی پیشکەوتوی بسەلمینین کە ئەم‌هەستو باوەرە بەلیدانو کوشتنو برینو سزاو ئەشکەنجە لەناو نەچوەوناچی بەلکو تا هاتوەو تا دیت گرو کلپەی زیاد دەکاو تیژ تر دەکا ، جا ئەو دەولەتانەی خاکی کوردستان دابەش کراوە بە سەریاناو لە گەل کوردەکانا باش نینو مافی نەتەوایەتی ئەم نەتەوەیە دەکەن بە ژیر لیوەوەو لە حقیقەت لائەدەن وە هەست بە بونی ئەم هەستو باوری کوردایەتیە ناکەن وە ئەیخەنە پشت گوی کەوجن بویەبە پێی باری میژووی کورد ئەم هەستو باوەرو ئەم بزوتنەوەیەی کورد لە هەرپینج وولاتەکەدا بە یەکەوە نەنوساونو یەکیان نەگرتوە لە گەل ئەوەشا سنوریان یەکەو مال بە مالەوەن بە خاك پیکەوە نوساون چونکە زروفی سیاسی لە یەکی دابریون ، بویە تا ئیستا ئەم بزوتنەوانە بە جیا کراونو پیلانو نەخشەیەکی یەك گرتوو ریکخراوو ریكو پیکیان نەبوە وە ریکخەرو شورشگیری راستەقینەو بە توانایان نەبووە ، کیشەی کورد کە یەکیکە لە گەورەترین کیشەی جهانی هاو چەرخمان، تا ئیستا بە شاراوەی مابووەو خرابوە پشت گوی لە لایەن ئەو نووسەرانەوە کە دەربارەی نەتەوەکان دەنووسنو نوسیویانە ، ئەمەش بەهوی ئەوەوە کە کورد گرییەکی گەورە بوە لە بەینی تورکیاو عەرەبو ئیرانا ، بویە

بە کێشەیەکی گرنك نەدراوە لە قەلەم نوسەران لە بەر خاتری خاتران چاوپوشیان کردوە لە دەرحستنی کێشەی کورد وە لە هەندمدانی بە کێشەیەکی نەوەوە ترنك بە شیوەیەکی پر لە راستی وەك بوەو هەیە ، بویە دراساتی کشتی لەم بابەتەوە زور کەم بوەو ، بەلام ئەوە ئەما کیشەی کورد نیستا بەرزترین وە دەرلەوتوترین شوینی بو خوی ئەرخان کردووە لە سیاسەتی جهانا وە لە ناو کیشە گرنگەکانی دەولەتانا ، لە ترو کلپەو بلیسەی لێ بەرز دەبیتەوە ، وەك شاخیکی ئاگرین بە ناوچەکانی روژهەلاتی ناوەراستنا بلاو ئەکاتەوە ، بزوتنەوەی ئەم دوایییەی کورد وە لەشکری پێشمەرگە لە ژیر ئالای پارتی دیموکراتی کوردستانی پیشرەو بە سەروکایەتی بارزانی مصطفى دەنگی دلیری کوردی گەیاندە هەموو شوینیکی دورو نزیكو بە هەموو جیهانا بلاوی کردەوە ، وە بوم هوی وەرگیرانی سەرنجی هەموو نەتەوەکانی جهان بەلای بونی نەتەوایەتی کوردو نەتەوەی کوردو کیشەی کـــــــوردا .

★ ★ ★

## پەیمانـــی ســـــیڤر : ـ

لە کونگرەی « سان ریمو »دا کە لە روژی ١٩ی نیســانی ١٩٢٠دا گــیراو ت روژی ٢٦ی خایاند بریار دراوە لە سەر دەسەلاتداری بەریتانیا بە سەر وولاتـــی « ما بين النهرين » وە « فەلەستین »دا وە بەریتانیا موصـــلی بو خـــوی لاداوە و بەلینی داوە کە لە ٪٢٥ی بەروو بوومی نەوت بدا بە فەرەنسە لە دوای چەنـــا

کوبونەوەیەك پەیمانی سیڤیر گیراو مورکرا لە روژی ١٠ی ئابی ١٩٢٠ ز دا .

لیرەدا نامانەوی بە دورو دریژی لەو پەیمانە بکولینەوەو بیرو باوری خومانی دەربارە دەربرین ، بەلام بە پیی چواردە نوختە ناو دەرکردوەکەی سەروکی ئەمریکا بنەزوك « ویلسون » کە دەلیت « هەمو نەتەوەیەك مافی هەیە پاشە روژی خوی بو خوی دابنیت بە پیی ئارەزوی خوی بەو پییە ئەم پەیمانە مافیکی دا بە نەتەوەی کورد لە کوردستانا ، ئەو بەندانەی کە باسی کوردی تیا بو وە بو کورد سودی هەبو لە پەیمانی سیڤیردا تەنیا بەندی ٦٢ و ٦٣ و ٦٤ بو کە ئەویش « شەریف پاشا » کە بو داوا کردنی مافی نەتەوایەتی کورد چو بو « پاریس » داوای لە کونگرەکە کرد کە مافی نەتەوایەتی کورد نەکەن بە ژیر لیوەوە ، ئەوانیش لە بەر ئەم داوا کردنە ئەم بەندانەی خوارەوەیان لە بارەی کیشەی کوردەوە لە گەل بەندەکانی تری پەیمانەکەدا تی هەلکیش کرد وە مافی نەتەوایەتی کوردیان بە رەسمی خستە سەر کاغذو دانیان نا بە بونی ئەم مافەدا .

بەندی ٦٢ :ــ ئەلیت :ــ

هەر یەکە لە حکومەتانی فەرەنسەو ئینگلیزو ئیتالیا سەرو ئەندام بنیرن ، ئەم ئەندامانە لیژنەیەکی سی قولی لە ئەستەمول پیك بینن ، بە شەش مانگ دوای چەسپاندنی ئەم پەیمانە سەربەخویەکی ناوچەیی بدریت بەو شوینانەی کوردی تیا جی نشینو کەوتونەتە روژهەلاتی « فرات » وە خواروی روژ ئاوای ئەو سنورەوە کە لە پاشا دادەنریت بو ئەرمەنستان وە ژوروی ئەو سنورە کە سوریەو « موزو پوتامیا » لە یەك جیا ئەکاتەوە .

ئەگەر هاتو ئەم ئەندامانە لە هەندی شتا بیرو باوریان یەکی نەگرت ، ئەبی

هەر یەکەیان لەم بابەتەوە حکومەتەکەی، خوی ئاگادار بکا ، وە پێویستە لە سەر ئەم لیژنەیە کە ریك کەوتن لە سەر هەموو شتیك ، باسی پاریزگاری مافی نەتەوەکانی تریش بکەن وەك نەستوریەکان کە لە وولاتەدا دەژین ، بو ئەوەی مافی نەتەوایەتی ئەوانیش لەو هەریمەدا پاریزگاری بکریت ، بو بردنە سەری ئەم مەبەستەش لیژنەیەکی « ٥ » قولی لە بەریتانیاو فەرەنسەو ئیتالیاو ئیرانو کورد پیك بیت ، ئەمەش ئەگەر بە پیویست زانرا بو دانانی سنور بە پیی ئەو پەیمانە لەو سنورانەدا کە دەکەونە بەینی تورکیاو ئیرانەوە •

بەندی ٦٣ : ــ ئەلیت : ــ

حکومەتی « عوسمانی » لە ئەمرووە بەلین بدا کە بریارەکانی ئەو لیژنەیە کە لە بەندی، ٦٢ی پەیمانەکەدا باسکراوە لەو کاتەوە کە ئاگادار دەکریت تا ماوەی سێ مانگ هەموی بەریتە سەرو بیانچەسپینی •

بەندی ٦٤ : ــ

لە پاش ئەو پەیمانەی کە دروست بو ، ئەگەر لە ماوەی سالیکا ئەو کوردانەی کەوتونەتە ئەو هەریمانەوە کە لە بەندی « ٦٢ »دا لیی دواین داوایان لە کومەلی نەتەوەکان « عصبة الامم »کرد کە زوربەی کوردەکانی ئەم ناوچەیە ئەیانەوی لە تورکیا جیا بینەوەو سەربەخوبن « کومەلی نەتەوە »ش دان بنێیت بەوەدا کە ئەمان ئەم توانایەیان هەیە ، تورکیا هەر لە ئیستەوە لە سەر ئەو راسپاردەیەی کومەلی نەتەوە بەلین ئەدا کە دەست لە هەموو ئەو مافانە هەلگری لەو ناوچانەدا ئەم پەیمانە هەرچەند دلنیایی‌یەکی بەخشی بە کوردەکان لە کاتی خویا ، بەلام

ئەنجامیکی نەبو ، مصطفی کمال پیی قایل نەبوو ، وەستاندنی شەر لە ١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا لە بەینی یونانیەکان و تورکەکانا لە سەر حسابی پەیمانیکی تازە کراو بە ناوی پەیمانی « لوزان »ەوەلە سەر هاندانی لورد « لوورزون » بـو .

لە روژی ١٣ تشرینی دووەمی ١٩٢٢دا نە « لوزان »کونگرەیەك بەسترا چەند مانگیکی خایاند ، تورکەکان لە پاش ئەوەی کە هەستیان کرد بە مانـدو بون و پەریشانی بە دەست جەنگی دورو دریژی بیئەنجامەوە ، بە ناچاری لەم کونگرەیەدا بەشداریان کرد ، بەشداریەکەشیان بـەو بـونەیەوە بو کـە پشتیان قایم بـو بەوەی کە یەکیەتی سوڤیت لایەنگریان ئەکا وە یاریدەیان ئـەدات ، وە بونـی ناکوکیش لە نیوەند بەریتانیاو فەرەنسەدا کە بە تەواوی لەو کانەدا روو لە زیادی بو بەهوی ئەو پەیمانەوە کە گیرابو لە ئەنقەرە لە بەینی فەرەنسەو تورکیـادا ، وە چاوەریی ئەوەشیان دەکرد کە ئەمریکاش پشتگیریان بکات ، چونکە خەریکـی ریك کەوتن بون لە گەلیاو بەلینی دانی ئیمتیازی نەوتیان دابویە .

لەم کونگرەیەدا تەنیا باسی مافی نەتەوایەتی کوردەکانی تورکیا کرا لە گـەل پاشە روژی ولایەتی موصل چونکە نوینەرانی تورك ئەیان ووت ، جیاوازیەك نیە لە بەینی کوردەکان و تورکەکانا ، لە گەل ئەوەشا کە زمانیان جیاوازە بەلام هەر نەتەوەیەکن و پیکەوەن و لە رەگەزیکن و یەك ئایین ئەپەرستن و رەوشت و خوشیان وەك یەکە ، لە گەل ئەمەشا چەند بەلینیکی درویان ریز کرد دایان بە کوردەکـان بو چاو بەستی کردن لە ئەندامانی کونگرەو کردنی مافی نەتەوایەتی کورد بـە ژیر لیوەوەو دیزە بە دەرخونە کردنی کیشەی کورد بەریتانیاش وەك پـیرە ژنی عەیار بە جوریکی وا چەرخ و فەلەکی سیاسەتی چەوتی خستە کار توانی پاشقولیك

له فەرەنسە بگریت‌و ولایەتی موصل له چنگ فەرەنسە دەربێنێ سەرەك نوێنەرانی فەرەنسا « کلیمونسو » له باسی دابەش کردنی تورکیادا ووتی : ــ بەلی من بــە کردەوە وازم له ولایەتی موصل هێنا ، ئەمەشــم بویە کرد بــە « کیلیکیــا »و « ئەسکەندەرون »ەم دەست کەوی بویە بە ئینگلیزم ووت‌موصلتان ئەوی یــان « کیلیکیا »؟ ووتیان موصلمان ئەوی ، بەم جورە روژ ئاوایی‌یە داگیر لــەرەتان یاری بە پاشەروژی نەتەوە دواکەوتوە هەژارە بی دەسەلاتەکان ئەکەن ، بەم جورە بەریتانیا فەرەنسەی هەلخەلەتاندو نەوتەکەی بو خوی برد ، وە له پیناوی نەوت‌و دەست کەوتی خویا مافی کورد تیا چوو ، چونکە پەیمانی « سیڤیر » هەر لــــە سەرەتاوە دیار بو پەیمانیکی خاوو خلیسکە ، کوردەکان بە رەسمی لەم پەیمانــە سودیان وەرگرتبو ، نەیان توانی له هەلی شەری بەینی یونان‌و تورکیا ســـود وەرگرن وە لەو هەلە گەورەیە کە بویان هە لکەوت سود بەخش بن‌و دەســت بکەن بە جولانەوەو داوای مافی نەتەوایەتی خویان بکەن بە پی‌ی بەندەکانــــی پەیمانی « سیڤیر » وە مافەکەیان بچەسپینن ، بە پیچەوانە پرو پاگەندەی تورکەکان دەماری ئیسلامیەتی گرژ کردن‌و جولاندی‌و وە هینانیە جوش ، شان بە شــان یارمەتی تورکەکانیان دا وە یارمەتی مصطفی کمالیــان دا وە له شــەری یــونانندا سەریان خست ، هەمو مافی نەتەوایەتی‌و دەست کەوتی کوردیان له پیناوی بــرای دینی‌و تعصبی دینی‌دا خستە لاوە کردیان بە قوربانی دوو چاوی کالی مصطفی کمال کوردەکان له کاتی تەنگانەدا لەو تەنگ‌و چەلەمەیەدا کە هاتبوە ریی تــورکەکان‌و مصطفی کمال دالسوزانە پشتی تورکەکانیان گرت کە بە برای دینی خویان دانابون کەچی پاش سەرکەوتن وە رزگار بونیان له تەنگ‌و چەلەمەو له ناوچوز ئـــەو برای دینیانە له جیاتی ئەوەی پاداشتی کوردەکان بە چاکە بدەنەوە مصطفی کمال

شەقیکی هەلدا لە پەیمانی « سیڤیر » وە رەفزی کرد وە کوردەکانی دایە بـــەو چــــــــەپوك •

مسیو « بونکاریە » حەقی بو کە ووتی پەیمانی « سیڤیر » لە کارگەی ( سیڤیر) دروست کراوە کە کاشیو فەخفوری تیا دروست دەکریت بویە ئەم پەیمانەش وەك چون گولدانیك کە لە شوشە دروست کرابیت کە کەوت دەشکی‌ئەمیش وا وردو خاش بو شکا ، ئەم پەیمانەش بە سەرکەوتنی هیزی مصطفی کمال لە یوناندا لە سەر ئاوی زیی « ساکاری » لە سالی ١٩٢١دا وردو خاش کــرا •

تورکیا لە تەنگ چەلەمەکەی رزگاری بو توزیك بوژایەوە لە ئەیلولی ١٩٢٢دا هەموو ولاتەکەی خوی داگیر کردەوە لە تەموزی ١٩٢٣داله کونگرەی «لوزان»دا پەیمانی تازە گیرا بەم جورە پەیمانی « سیڤیر » هیچ خیریکی نەبو بو نـــەتەوەی کورد ئەوە نەبی کە دان نرا بە بوونی مافی نەتەوایەتی کورددا لە پەیمانیکـــــی دەولەتانا بو یەکەمجار •

## پــــەیمانـــی لــــوزان

لە مانگی تەموزی ١٩٢٣دا ئەم پەیمانە لە لوزان گیرا پەیمانی سەرکەوتن بو بو تورکیاو شێلانی مافی نەتەوایەتی کورد لە کوردستانا ، بە تایبەتی سەرکەوتن بـــو مصطفی کمال ئەو بەلینانەی تورکەکان دابویان بە کوردەکان هەموی‌خرانە ژیـــر پیوە ، لە سالی ١٩٢٤دا دوانو قسە کردن بە زبانی کوردی لە هەمو کوردســـتانا قەدەغە کرا بە رەسمی ئەو کومەلە نیشتمانیانەی کە پیك هاتبون لە لایەن روشن بیرانی کوردەوە وەك « میر ئەمین عالی بدرخان » وە کامەران بەدرخان وە شیـــخ

عبدالقادری نهری و چەند روشن بیریکی تری کوردەوە ، وەك « کومەلی نەتەوەی کورد » وە کومەلی ( بەرزی کورد ) وە کومەلی « سەرکەوتنی کورد » وە «حزبی نەتەوەی کورد » وە زور کومەلی نهینی تریشں هەموی داخرانو روشن بیرانو خویندەوارانی کورد کە ناسرابون بە خاوەنی بیرو باوەری نیشتمان پەروەری دوور خرانەوە •

★★★

## میژووی بزوتنەوەی سیاسی کورد : ــ

میژووی بزوتنەوەی کوردایەتی بە سێ قوناغا تیپەریوە : ــ

١ ــ لە چەرخی نوزدەهەمەوە تا شەری جهانی یەکەم •

٢ ــ لە شەری جهانی یەکەمەوە تا شەری جهانی دووەم •

٣ ــ لە شەری جهانی دووەمەوە تا ئەمرو •

قوناغی یەکەم : ــ

ئەم شورشانەی تیا بەرپا کراوە : ــ

١ــ شورشی عبدالرحمن پاشای بابان لەسالی ١٨٠٦ وەتا ١٨٠٨ لەهەریمی سولەیمانیدا

٢ ــ شورشی ئەحمەد پاشای بابان لە سالی ١٨١٢دا لە هەریمی سولەیمانیدا •

٣ ــ شورشی کوردە « زازا »کان لە سیواس لە ١٨٢٠دا لە موصل •

٤ ــ شورشی ئەمیر بدرخان « جزیرە » لە سالی ١٨٢١زدا تا ١٨٤٧ ز لە سوریا

٥ ــ شورشی محمد پاشای کویرە لەسالی ١٨٢٦زدا وەتاسالی ١٨٣٣ز لەرەواندز

٦ ــ شورشی کوردەکانی « سنجار » لە سالی ١٨٣٠ز تا ١٨٣٣ز •
٧ ــ شورشی ( ابو شرف خانی تلیسی ) لە ١٨٣٤دا لە تورکیا •
٨ ــ شورشی « عزالدین شیر » لە ١٨٣٥دا لە تورکیا •
٩ ــ شورشی حسین کنعان و حسان پاشای کنعان لە ١٨٧٩ز لە تورکیا •
١٠ ــ شورشی شیخ عبیداللـە شمـدینی لە ١٨٨٠ ز تا سـالی ١٨٨١ ز لە تورکیا
١١ ــ شـورشـی کوردەکانی موصـل •
قـونـاغـی دووەم : ــ
١ ــ شورشی کوردستانی عیراق بە سـەروکایەتی شـیخ مەحمـود لە سـالی ١٩١٩ زتـا ١٩٣٢ ز •
٢ ــ شـورشی کوردسـتانی ئـیران بە سەروکایـەتی اسماعیل خانی سـمکو لە سـالی ١٩٢٠ ز تـا ١٩٣٠ ز •
٣ ــ شـورشی کوردسـتانی تورکیـا بە سـەروکایەتی شـیخ سعیدی پیرو فەرمانـدەری « حزبی تعالی » لـە سـالی ١٩٢٥ ز •
٤ ــ شورشی کوردستانی تورکیا « ئاگـری داغ » بە سـەروکایەتی احسـان نوری پاشـا لە سـلی ١٩٢٦ز تـا ١٩٣٠ ز •
٥ ــ شـورشی ناوچەی بارزان بـە سـەروکایەتی شیـخ ئەحمـەدی بـارزانی لـە سـالی ١٩٣١ ز تـا ١٩٣٤ ز •
٦ ــ شـورشی کوردسـتانی ئـیران بـە سـەروکایەتی « جعفـر سـلطان » لـە هـەورامان لە ١٩٣١ ز تـا ١٩٣٢ ز •
٧ ــ شـورشی کـوردەکانی تـورکیا لە هەریمـی ( دیـار بکر )لە ١٩٣٤زدا •
٨ ــ شورشی کوردەکانی تورکیا « دەرسـیم » لـە ١٩٣٧ ز دا •

قـونـاغی سـێیـەم :ـ

١ ـ شـورشی کوردسـتانی عیراق بە سـەروکایەتی « مصـطفی بارزانـی » لـە سـالی ١٩٤٣ ز تـا ١٩٤٥ ز •

٢ ـ شـورشی کوردسـتانی ئـیران بـە سـەروکایەتـی « قاضـی محمـد » وە حزبـی دیموکـراتی ئـیران لە سـالی ١٩٤٥ ز تـا ١٩٤٦ ز •

٣ ـ شـورشی « جوانـرو » لـە ئـیرانا لە ١٩٥٦ زدا •

٤ ـ شـورشی گەورەی ئیسـتامان لە کوردستانی عیراقدا بـە سەروکایـەتی پارتـی دیمـوکراتی کوردسـتانـیو بـارزانی مصـطفـی کـە لـە سالی ١٩٦١دا بـەرپـا کـرا •

# باری سیاسی عیراق وه کوردستانی عیراق له پیش شــەری جهــانــی دووەمــــدا

بــاری ســیاسی عیراق‌و کــوردستانی عــیراق له پیشــ شــەری جهانــی دووەمــدا به جــوریك بو که منافەســەیەکی گــەورە لــە نیوەنــد وولاتــە ئیمپریالیزمەکانا هەبــو له ۱۹۳۳ زدا گەیشتبوه رادەیــەك له ســەر دووبــارە دابەشــ کــردنەوەی وولاتــە داگــیر کــراوەکان له نیوان خویانــدا پاشــ ئەوەی « المانیــای نــازی » وەك دەولەتیکی ســەرمایەداری پر چەك‌و به توانا پەیــدا بــوو له ئەنجــامی پشت گــیری‌و یاریــدەدانی ولاتــە ئیمپریالیزمەکان بە نیــازی ئەوەی له دژی « یەکیەتی ســوڤیت » بــە کــاری بهینن چونکــە شــورشی اوکتوبــەری ۱۹۱۷زور ســەرکەوتنی وه دامەزراندنی یەکەمــین دەولەتی اشــتراکی له جهانــدا که ئەمە بــوه هوی ئــەوەی نەتەوەکانی ســەر زەمــین چــاویان بکــریتەوەو هــیوای بــزوتنەوەو جولانــەوەی نەتەوایەتیان ببــی ، جا بویــە دەولەتە ئیمپریالیزمەکان به هەمو توانــایانەوە هەولیان ئــەدا بو ببــەهیز کردنی ئەلمانیای هتلەری تا رادەیەکی وا له ســالی ۱۹۳۳دا حزبــی نازی له ئەلمــانیادا هینــرایە ســەر حوکم ، له جیاتی ئەوەی ئەم هیزو تــواناو یاریدەیەی درا به ئەلمانیــای نــازی تــا به کــاری بهینــی له دژ یەکیەتــی ســوڤیت‌و بەســ ، کەچــی بوه هــوی منافســە لــە بەینــی ئەمەریکــاو ئینگلیزو فەرەنســەدا بو دابەشــ کــردنی م ســتعمرات‌و دەســەلات داری له بەینیاندا دوبارە ، به تایبەتی له روژهەلاتی ناوەراســت‌و ئەفریقادا ، جــا لــە

ئەنجامی منافسەی نیوەند ئەم دەولەتە ئیمپریالیزمانە شەری دووەمی جهانی لە سالی١٩٣٩دا بەرپابو ، پیشس ئەوەی شەری دووەم هەلگیرسی واتە دوای داخل بونی عیراق بە «عصبة الامم» لە سالی ١٩٣٢ز تا رادەیەك بزوتنەوەی دیموکراتیو کوردایەتی بەرەو جولانەوە ئەرویشت ، ئەوەبو لەو ماوەیەدا « کومەلی لاوان » بە سەروکایەتی « ئەمین زەکی بەك » لە بەغدا لە ١٩٣٣دا دروست بو ، بە هاوکاری کردنی خوێندەواران وە روتس بیرانی کورد یەکەم گوڤاریان بە ناوی « دیاری لاوان » ەوە دەرکرد ، هەروەها لە سالی ١٩٣٥ ز لە بەغداد جماعەتی « الاهالی » کە کومەلیکی دیموکراتی خواز وە روشن بیرانی عەرەب بون کەوتنە خەباتو تیکوشان لە پیناوی بلاو کردنەوەی بیرو باوەری دیموکراتیدا کومەلی « الاهالی »پیك هاتبون لە پیشەوای نیشتمان پەروەر « جعفر ابو تمن » وە « کامل چادرچی »وە ( محمد حدید ) وە ( عبدالفتاح ئبراهیم ) وە « حسین جمیل » وە « عبدالقادر اسماعیل بستانی » وە هەروەها دوا بە دوای ئەوە بزوتنەوەی کوردایەتی بە توندی پەرەی سەند بە جوریکی وا کە هەموو جگەرسوزانی کورد لە دامەزراندنی کومەلیکی سیاسی ریكو پیك دەرکردەوە لە ئەنجامی ئەو بیر کردنەوەیەدا کومەلی « برایەتی » لە سلیمانی بە سەروکایەتی شیخ لطیف شیخ مەحمود دامەزرا ، لە نیشتمان پەروەرانو روشن بیرانو ئەفسەرانی کورد ئەم کومەلە لە سالی ١٩٣٨ز دا دامەزرا •

هەروەها روشن بیرانو نیشتمان پەروەرانی کورد لە شارەکانی تری کوردستانی عیراقدا بیریان لەوە دەکردەوە کە حزبیکی سیاسی ریکخراو وخاوەن پەیرەو پروگرام پیك بهینن ، بو ئەوەی پیشرەوی بزوتنەوەو شورش

گیری نەتەوایەتی کـورد بکا لـە کوردسـتانی عـیراقدا ئەوەبو لە سـالی ۱۹۳۹ز دا حزبی « هیوا » دامەزرا بە سـەروکایەتی ماموستا « رفیق حلمی » .

لە پاشـی جولانەوەی رشیـد عالی لە عیاقدا لە ۱۹٤۱زدا خـوالی خوشـبو شیخ مەحمود کە لە بەغداد دەست بە سـەر بو توانی لە بەغدادەوە فیرار بکـاو خوی بگەیەنیتەوە کوردسـتان وە لە دیی « داری کەلی » نیشـتە جی بیـی بەهوی یارمەتی دانی حزبی « هیوا »وە ، لەم کاتەدا لە بەر ئەوەی باری سیاسی عـیراق بە باشی ئەرویشـت بە ریوە بە نسـبەت کوردەوە چونکـە لەو کاتەدا شـەری دووەمی جهانی بو نەیان ئەویست کورد بورووژینن ، حکومەتی عیراق‌و بەریتانیای اسـتعماری نەیان ئەویست جاریکی تـر خویان تووشـی شورشیکی تـری کورد بکەنەوە ، بویە لە سـالی ۱۹٤۳دا ملا مصطفی بارزانی کە لە شاری سـولەیمانیدا دەسـت بە سـەر بو بە یاریدەی حزبی هیوا وە شـیخ لطـیف شیخ محمـود فـیراری پی کـراو گەیانـرایەوە خـاکی بارزان ، لـە داوی گەیشتنەوەی ملا مصطفی بو بارزان حکومەتی عـیراق بە هەمو هیزو تـواناى سـەربازیەوە ویسـتی دەستیکی گەورە لە کورد بوەشـینی بە تایبەتـی لـە بارزان ، ئەوەبو حکومەتی عـیراق هیرشیکی گەورەی سەربازی کردە سـەر بارزان بە یاریدە دانی هیزی بەریتانیا ، لە دوای چـەند شەریکـی خوینیـن‌و کوشتاریکی زور لە سـوپای عـیراق‌و سەرکەوتنی یـەك لـە دوای یەکـی کوردسـتان حکـومەتی عـیراق ناچار بو داوای صـلح بکـات لـە سـەر کـردایەتی شـورشی ، ئەم داوا کردنەشـی بی گومان لە سـەر داوا کردنـی بەریتانیا بوە ، چونکـە لەو کاتەدا سـویند خوران گلایون بە شـەری دووەمی جهانەوە ئەم شبـەرەشی لە گەل کوردا دەبوە هوی زیانیکی زور لـە جهـازی

جەنگی شوێند خواران ، بە بەر ئەوە حکومەتی عیراق و بەریتانیا ناچار بون داوای ڕیکەوتن بکەن ، لەم کاتەدا نوری سعید وەزرەتی تشکیل کرد لە ١٩٤٤دا وە داوای لە « ماجد مصطفی » کرد نە بەسدار بیت لە وەزارەتەکەیدا چونکە نوری سعید وایدەزانی کە « ماجد مصطفی » پەیوەندی هەیە بە بزوتنەوەی کوردایەتیەوە بویە چاکترین « عنصر »ە بە نسبەت خویانەوە کە بتوانی لە گەل سەرکردایەتی شورسی کوردا بگەن بە ئامانج و لە یەك بگەن ، پاشی گفتو گو کردنی مجد وە بارزانی ، ماجد گەرایەوە بو بغداد و ئەو داوا کاریانەی بارزانی پیشکەش کرد بە حکومەت کە پیك هاتبو لە حەوت بەند ، ئەم داوا کاریانە جی بە جی نەکران لە گەل ئەوەشا کە حکومەت قبولی کردو دانی نا بە جی بە جی کردنا بەم جورە مایەوە تا روژی ١٠ / اب ١٩٤٥ حکومەتی عیراق بە یاریدەدانی بەریتانیا لە ژیر فەرماندەی جنرالی بەریتانی « رنتن » دا هیرشیکی گەورەیان بردە سەر کوردستان لە هەریمی بارزاندا ، ئەم هیرشە ئەوەندە توند بو بارزانی مصطفی وە هەموو شورشگیران ناچار بون کە بچنە خاکی ئیرانەوە کە لەو کاتەدا ئەو ناوچەیە لە ژیر چاودیری و دەسەلاتی یەکیەتی سوڤیتا بو .

## بزوتنەوەی سیاسی لە کوردستانی ژوروودا

### شورشی شیخ سەعیدی پیران : ـ

لە دوای پاداشتی چاکە دانەوەی کوردەکان لە لایەن مصطفی کمال بە قەدەغە کردنی قسە کردن بە زمانی کوردی وە دەر بە دەرکردنی کوردەکان وە پلاو پێ کرنی روشن بیرانو نیشتمان پەروەرانی کورد لە سالی ۱۹۲۵دا بە سەروکایەتی عقید « خالد بەگ » سەروکی خیلی « جەبران »وە شیخ سەعیدی پیرانی لە مانگی شوباتدا جولانەوەیەك دەستی پێ کرد ، لەم جولانەوەیەدا هەمو ئەفسەرو روشن بیرانو سەرك خیلەکانی کورد بەشداریان کرد لە شورشدا کە بەرپا کرا لە « قنج »لە بەینی « ئەرغانا »و ( بدلیس )دا زور بە توندی تا کوتایی مانگی شوبات زیاد لە چواردە ولاتی گرتەوە وەك « دیار بەکرو مەعمورەی عەزیزو خەرپووتو وانو بەشی خواروی ئەرزو روم » حکومەتی تورکیا زور باش لەوە گەیشتبو کە مەبەستی بەرو دوا لەم شورشە دامەزراندنی دەولەتیکی سەربەخوی کوردە ، ئەنجومەنی نوینەرانی تورکیا فەرمانی ئەبلووقە دانی ئابوری ئەو ناوچانەیان دا ، سوپایەکی گەورەشیان نارد بو سەر شورشگیران بو دامرکاندنەوەی ئەم شورشە ، وە زور بی رەحمانەو بە توندی لە کوردەکانیان دا تا نووسەر « ایچ • سی ئارمسترونگ دانەری پەرتووکی « مصطفی کمال ، گورگی بۆر » « الذئب الاغبر » لە تەرجمەی عەرەبیدا ئەلیت « کوردسان » بە ئاسن ویران کرا ، بە ئاگر سوتینرا ، پیاوان سزا درانو کوژران ، دیهات هەموو سوتینران ، دەغلو دانە ویلە لە ناو برا ، منالو ژنو

کچ فرینـــدرانو سەر بــرران ، دادگای سەربازی تایبەتــی گــاڵەی کــرد بــە کوشتنی ئەم کوردانەو ســزادانو خســتنیان بو ناو بەندیخــانە ، بــەم جورە شیخ ســەعیدی پیرانیو خالد بەگو زور لە هاوریکانیــان گــیرانو دران بــە دادگــای عورفــیو حوکمی اعدامیــان درا ، لە گــەل ٤٨ پیشــەوای تــری کوردا هەمو لە قەنارە دران ، ئەم توندو تیژیەی تــورکەکان ، وە ئــەم خویــن رشــتنو کــردەوە نارەوایانە بوە هوی هەلگــیرساندنی ئاگــری رقە بــەری وەبزواندنو گــرژکردنی دەماری نەتەوایەتیوتولە ســەندن لەلایەن کوردەکان •

## شــورشی ئەگــری داغ « ئارارات » : ــ

کونگــرەیەکی نهینــی لە « ئاگری داغ » « ئارارات » گــیرا لە بــەهاری ١٩٢٧دا کە شاخیکی بەرزە لە کوردســتانی تورکیادا ، نوینەرانی هەموو کومەلو ریکخــراوە ســیاسیەکانی کورد لە گەل نــوینەرانی خیلــە کــوردەکانا تیــا بــەشــــدار بـــون •

وە هەروەها لە شــارەکانەوە نوینەران بە زوری هاتــن وە بەشــدار بــون ، بە گشــتی ئــارا بــریاریان دا کە تا مــردن یــەك بــنو خــەبات بکــەن تــا تورکەکان لە خاکی کوردســتان دەر ئــەکەن ، وە هەروەهــا بــریاری ئاشت بونەوەشیان دا لە گــەل ئــەرمەنیەکــانی دراوســییانا •

له روژی ٥ تشرینی یه‌که‌می ١٩٢٧دا حزبی « خوی بون » دامه‌زرا هه‌مو کومه‌له‌کانی پیشو هاتنه ئه‌م حزبه‌وه‌و پیکه‌وه لکان‌و بونه یه‌ك ، « احسان نوری پاشا » کرا به‌فه‌رمانده‌ری گشتی وه « ئیبراهیم پاشا حسکی تیللو » کرا به « به‌ریوه به‌ری گشتی شاره‌وانی » له ئه‌گری داغ ـ ئارارات ئالای کورد هه‌لکرا .

حکومه‌تی « ئه‌نقه‌ره » ناچار بو که‌وته گفت‌و گو کردن‌و ریك که‌وتن له گه‌لیانا ، له ئه‌یلولی ١٩٢٨دا لی‌بوردنی گشتی له‌وانه که‌واز له جولانه‌وه دینن‌و سه‌ر دائه‌نوینن بو حکومه‌ت بلاو کرایه‌وه ، کورده‌کان به‌مه قایل نه‌بون ، ئنجا حکومه‌ت ده‌ستی دایه چه‌ك دوو فرقه‌ی ته‌واوی له ژیر فه‌رمانده‌ی « صالح پاشا » ناودا نارد بو ده‌ورو پشتی « ئه‌گری داغ » « ئارارات » له پاش شه‌ری زور گه‌وره سوپای حکومه‌ت بریاری دا که ته‌نگ به کورده‌کان هه‌لچنی به‌هوی برسی کردنیانه‌وه ، ئابلوقه‌ی ئابوری شاخی ئه‌گری داغی‌دا ، پاش ماوه‌ی سالیك له برسانا‌و له په‌ریشانیا کورده‌کان ناچار سه‌ریان دانه‌واند وه « احسان نوری پاشا » په‌نای برد بو حکومه‌تی ئیران ، له پاش ئه‌م کاره‌ساته حکومه‌تی تورك کوردستانی کرد به چوار به‌شه‌وه وه یاسا « قانون » ژماره‌یه‌کی ده‌رکرد له ئایاری ١٩٣٢دا ، یه‌کیك له‌م چوار ناوچه‌یه کرا به ناوچه‌ی محرمه « قه‌ده‌غه » وه چول کرا له دانیشتوانی به ناوی « هوی ته‌ندروستی » یه‌وه که هوی له ناوبردنی خیله‌کایه‌تی‌و رژیمی خیله‌کایه‌تی بو له ناو کورده‌کانا ، هه‌مو مافیکی نه‌ته‌وایه‌تی له کورده‌کان قه‌ده‌غه کرا ، ده‌سه‌لاتی سه‌روك‌و ئاغاو به‌گ‌و شیخ نه‌ما ، هه‌رچی ده‌زگای ریکخراوه

سـیاسـی‌و روشن بیری‌یه‌کان هه‌بو هه‌موی داخران ، بـریار درا به‌و له‌سانه‌ی که به ره‌که‌ز تورك نه‌بن مافی ئه‌وه‌یان نه‌بیت له دیهات‌و ملـکیـان بیی ، وه مافی دروست کـردن‌و پیکه‌وه‌نانی هیچ جوره کومه‌لیکیان نیـه • وه لـه‌م روژه‌وه ئه‌و کـوردانه‌ی له تورکیادا ئه‌ژیـن ناو نـران « تورکی چیـا » •

یاسـای « قانون » تواندنه‌وه‌ی نه‌ته‌وه‌ی کـورد له بـوته‌قه‌ی تورکایه‌تیـا بـوه هوی هه‌لچـون‌و به‌هیز کـردنی گیانی خوبه‌خـت کـردن‌و ده‌مـاری کوردایه‌تـی گـرژ کردن له ناو کورده‌کانا ، له « ده‌رسـیم » ئه‌م یاسـایه زور کاریگه‌ر بو چونکـه ناوچه‌ی « ده‌رسـیم » له هه‌مو هه‌راو زه‌ناو جولانه‌وه‌یه‌ك دوور بو وه هه‌رگیز له هیچ بزوتنه‌وه‌یه‌کا به‌شـداری نه‌کـردبو له دژ حکومه‌ت دانیشتوانی ئه‌م ناوچه‌یه به توندی بـه‌رگـری دوور خسـتنه‌وه‌یان کـرد وه شـورشیکی گه‌وره‌یان به‌رپا کـرد • حکومه‌تی تورك هیزی ناردنه سـه‌ر وه ناوچه‌که‌ی بومبا باران کـرد وه به توپ دایان بیژان له ئایاری ١٩٣٧دا •

« جلال بایـار » وه‌زیـری ناوه‌وه‌ی تورك ، دوای چه‌ند مانگیك رابواردن به سـه‌ر کوشتاری « ده‌رسـیم » دا له په‌رله‌مانی تـورکیادا به شـانازیه‌وه ده‌ری بری ووتی : ــ « کورده‌کان ته‌واو کـران ، ئه‌م دزو جه‌ردانه به زه‌بـری هیـزو چه‌ك کـران به شارسـتانی » •

## پەیمانی سـعد ئاباد : ـ

تورکیا پاشـ ئەو کوشـتارو بـرینە دیسـان باشی بـوی دەرکەوت کـە نەتەوەی کوردی نەبەرد هەرگیز نامـری‌و لە ناو ناچـی وە هەرچـی کـردوە بەرامبەریان کەلك‌و سـودی نەبوە لە بەر ئـەوە بـیری لـەوە کـردەوە کـە دراوسـی‌کانی وەك عـیراق‌و ئـیران هان بدات لە کارەسـاتی لە ناوبـردنی نواندنەوەی کوردەکانا بەشداریان بکا وە لەم تاوانەیـانەوە بـگلینی ، داوای لی کـردن کە پیکەوە هەمـو هەول بـدەن وە هاوبەشـی بکەن بەم جـورە قایلـی کـردن کە پیکـەوە « پەیمانی دوسـتایەتی‌و دراوسـیتی ببەسـتن » لە روژی ٨ ی تمـوز ١٩٣٧دا لە کوشکـی « سـعد ئاباد » لە دەورو پشـتی « تاران » کوبونەوە تورکیـا بە پی‌ی ئەم پەیمانە بەلینی دا لە گـەل عـیراق‌و ئـیران‌و ئەفغانسـتان کە سـنوری بەینیان بپاریزن وەك لە بەندی حـەوتەمی ئەم پەیمانەدا دەلیت : ـ « هەمو لایەك لە لایەن بـالاکان کـە ئەم پـەیمانەیان بەسـتوە بەلین ئەدەن کە هەمو جورە کردەوەیەك کە پی‌ویست بی بەکاری بینن لە ناوچەکەیاندا بو ئەوەی نەیەلن جولانەوە سەر بەرز کردنەوە و چەتە گـەری وە کومەل‌و ریکخـراوی سـیاسی‌و هـەموو جورە ریکخـراویکی روشـن بیریش کە مەبەسـتیان تیکدانی ئاسایشـ بی لە هەر بەشـیك لە بەشـەکانی خاکی هەر یەکیك لەم لایە بالایانەدا وە لە سنوری شوینەکانی تـرا ، یان ببنـە هوی کارکـردن لە سـەر دەسەلاتی لایەك لە لایەکانی تـر » .

جا مەبەستی بەرو دوای ئەم چوار دەولەتە کە ئەم پەیمانەیان مور کرد لە ناو بردنی نەتەوەی کوردو جولانەوەی کوردەکان بو « لووسیان رامبورت » باسی

ماده حەوتی ئەم پەیمانە ئەکات ئەلیت :ـ « مەبەستیان لە دانانی ئەم مادەیە بو کوردەکانـەو بەس •

هەروەها ژیانی کوردەکانی تورکیا بە هیچ جوریك نـەگورراوە پەیمانی چوار دەولـەتەکەی کە لە دژ کورد گـیرا سـودی نەبوو بەلکو بوە یـەکەم هوی داگـیرساندنی ئاگری ئاکوکی لە تورکیادا کە لە ئەنجامدا تورکیای تەنکە تاو کرد بەشـدار بێی لە « میثاقی بغداد » « حلفی بغداد » دا لـە روژی ٢٤ی شـوباتی ١٩٥٥دا لە مانگی کانونی یەکەمی ١٩٥٩دا نزیکەی « ١٠٠ »کەس لە روشن بـیرانو پیاوە ناسـراوەکانی کورد گـیرانو خرانە بەندیخانەوە ، لـە دوای تەنگە تاو کردنی حکومەت لە لایەن نیشـتمانیەکانەوە بەرەلا کران لە سەر ئەمە لە دوای ماوەیەکی کەم حکومەتی تورکیا یاسـای «قانون» ژمارە «١٠٥»ی لە تشـرینی یەکەمـی ١٩٦٠دا دانا کە دەسـەلاتی داوە بە پولیسـو هـیزی ئاسـایش « امن » ئەو کەسـانەی هەست دەکریت کە خەریکـی جـولانەوەو کوردایەتین خویانو خیزانیان بگـرن بەم جورە « ٢٤٤ » کـورد لە تشـرینی دووەمی ١٩٦٠دا تاوان بار کـران بە موئامرە کـردن لە دژ حکـومەت • ئـەم رووداوە لە روژنامەی « جمهوریەت » لە ژمـارە ١٦ی تشـرینی دووەمی ١٩٦٠دا بـلاو کـرابـووە •

هەروەها ئەم دەسـت دریژیو شـوفینیەی کاربەدەسـتانی تورکیا بە ئاشکرا لـە دەسـەلاتداری روشـن بـیرانو کاربەدەسـتانی تـورکیادا لە وتـارو نوسـینەکانیانا روون دەبیتـەوەو دەر دەکـەوی •

---

« ١ » الاکراد والقانون لە وسینی لوسیان رامبوت بە فەرەنسی •

« بای دوغان کیلیج سیهبسنیانلی نووسەر لە گوڤاری « پاریش دونیاسی » « جهانی ئاسایش » لە ژمارەی حەوتەمی ١٩٦٢ای ئەم گوڤارەدا نوسیویەتی ئەلیت « روخاندنی ئیمپراتوریەتی عوسمانی بە گورجی وە ئەو دمورەی دانیشتوانی ئەم وولاتە کە تورك نین دیان ، وە ئەو خوینەی رژا لە پیناوی خەباتی نیشتمانیدا ئەم شتانە بوونە هوی بەهیز کردنی رەگەزایەتی بە توندی » بەم وشانەدا دەردەکەوی کە ئەو هەمو خو بەخت کردنو یارمەتی دانو لە سەر کردنەوەیەی کوردەکان بو مصطفی کمال لە کاتی شەری بەینی تورکو یونان هەمویان لە بیر چوەوە ، وە ئاشکراو روونە کە تورکیا بو بە وولاتیکی « رەگەزایەتی پەرست » کە ئەو رەگەزمشیو ئەونەتەوا یەتیەشی رەگەزایەتیو نەتەوایەتی تورك بیت ، ئەو نەتەوانەی رەگەزیان تورك نیە ئەبی لە بوتەی تورکایەتیدا بتوینەوە ، ئەگینا ئەبی لە ناو ببرین عصمت ئینونو » کە خوی کوردە وە رەگەزی خوی لە بیر خوی بردوتەوە لە کونگرەی « لوزان »دا ووتی « کوردەکان لە گەل تورکەکانا جیا نین لە گەل ئەوەشا کە بە دوو زبانی جیاواز ئەدوین . ئەم نەتەوەیە یەك پارچەو بەشنو رەگەزیان یەکەو باورو عادەتیان یەکە » ، وە هەر ئەو « عصمت ئینونو »یەشی بو کە لە سالی ١٩٢٣دا دانی نا بەوەدا کە « تورکیا وولاتی دوو نەتەوەیە ، تورکو کورد هەردوکیان وەك یەك مافیان هەیە لە حکمرانی وولاتا »وە هەر ئەو « عصمت ئینونو »یەشی بو کە لە سالی ١٩٣٠دا کە سەرەك وەزیران بو ووتی « هەر نەتەوەی تورك مافی داوا کردنی نەتەوایەتی هەیە لەم وولاتەدا هیچ نەتەوەو رەگەزی تر ئەم مافەیان نیە » .

« محمود اسعد » وەزیری دادگاە لە تورکیا لە بەیانیکا بە ئاشکرا

دانی نا بە بونی نەتەوەکانا کە تورك نین لە تورکیادا ، لە پاشس رابوردنی ماوەیەك بە سەر قسەکانی سەرەك وەزیران « عصمت ئینونو »دا ئەوەی روون کردەوە کە جگە لە تورك نەتەوەی تر هەیە لە تورکیادا ووتی « من هەستی خوم ئاشساوەمەوە ئەلیم تورك خوی گەورەی ئەم وولاتەیە ، ئەوانەی کە بە رەگەز تورك نین لەم وولاتەدا هیچ مافیکیان نیەتەنیا ئەو مافە نەبی کە نوکەرو عەبد بن » .

« جەنرال کورسیل » « ۱ » ووتی ئەگەر تەووركە چیایی بە سەر لی شیواوەکان هیمنیو ئاسایش پاریزگاری نەکەن ، بسوپا ئامادەیە بو بومبا بارانو توپ بو روخاندنی شارو دیهاتەکانیان ، جا ئەو وەختە وولاتەکەیان دەبی بە حەمامیکی خوین خویانو وولاتەکەیان لافاوی خوین دەیان با » .

*پەیمانی سایکس بیکو : ـ

لە کاتی جەنگی یەکەمی جهاندا لە مانگی مایس ۱۹۱٦دا بەریتانیاو فەرەنسە بە جووتە یە دزیەوە پەیمانیکیان پیکەوە بەست لە بابەت بەریوە بەری کارو باری وولاتی روژ هەلاتی ناوەراست ، بە ناوی پەیمانی « سایکس بیکو »وە

---

« ۱ » لە ۱٦ای تشرینی دووەمی ۱۹٦۰دا کورسیل نامەی ووت کە گوفاری « ئوریانت »ی فەرەنسی بلاوی کردەوە نوسینی « جان پییر فینو » .

واتــه به ناوی نوینەرە دبلوماسـیەکانی خویـانەوە « سیر مارك سایکس »«١»
نوینەری بـالای بەریتـانیا وە « مسیو جـورج بیکـو » نوینـەری بـالای
فەرەنسـه لە « قاهـرە » بەو پی‌یە لە سـەر نەخشـەی ئیمپراتوریەتی عوسمانی
خاکی ولاتی عوسـمانی‌یان دابەشـی کرد بە سـەر خویانا واتە دوو ناوچـەی
دەسـەلاتداری فەرەنسـەو بەریتانیا وە بە قەلەمی سـورو شـین أشـارەتیان
لیدا ، ناوچـەی سور کە پیـك هاتبو لە دولی رافدیـن « میسیو پوتامیـا »کە
ئەم ناوچەیە لە خانەقینـەوە لە کوردسـتانی خوارەوە دەسـت پی ئەکا دریـژ
دەبیتـەوە لە بەشی ژوورودا تا دەگاتە « کویت » وە ناوچـەی « شـین » کـە
پیك هاتوە لە خاکی سـوریەو لبنانو بەشیك لە ولاتی روژهەلاتی خـو روی
تورکیا « کوردستانی روژئاوا » بەشی سی‌یەمیش کە بە « قاوەیی » نەخشـەی
لیدرا ، خاکی فالەسـتین بو ، بریار درا ببی بە خاکیکی دەولەتان واتە لەمدا بەش
کردنەدا بەشـی « سوور » بەر بەریتانیا کەوتو بەشی « شین »بەر فەرەنسە .

بە بالیوزی روسیا « سازانوف » راگەیەندرا کە بریار پدا لە سـەر ئـەم
پەیمـانە ، بەو مەرجەی ناوچەی روژهەلاتی ژووروی تـورکیا بخـریتە سـەر
روسیـا وەك ریگای « تەرەبزونو بەشی ژووری روژئاوای کوردستان » بـەم
جورە خاکی کوردستان دابەشـی کرا بە سـەر سێ دەولەتی داگـیرکەرا .

---

« ١ »کردستان والاکراد دراسه سیاسیه واقتصادیه للدکتور ع قاسملو .

* شـــورشـــەکانی بارزان :ـــ

بنە مالەی بارزانی لە شیخەکانی بارزانن کە شیخی تەریقەی نەقشبەندین و لـە کونەوە لە بارزان نیشتەجی بوون و ماونەتەوە ، ئەم خیلە بریتییە لە خیلەکانـی « بەروژ ، دوّلە مەری ، شـیروانی ، مزوری ، نزاری ، گەردی » ، زیاتـر لـە « ٥٠ » هەزار کەس ئەبن ئەمانە بە کشـت و کال و بەخیو کردنی مەرو مالاتەوە سـەر قالن ، ئەم خیلە زور ئازاو چالاك و نیشتمان پەروەرو راسـتن لە ژیانیانا هەمیشە شـیرانە داوای مافی خویان و نەتەوەکەیان کردوە ، لە زەمانی حکومەتی عوسمانیدا بزوتنەوەیان هەبوە لە دژ سیاسەتی حکومەتی عوسمانی داگـیرکەر لە سـەر ئەمە لە سـالی ١٩١٤دا حکومەتی عوسمانی خوا لی خوشبو « شیـخ عبدالسلام »یان لە موصل اعـدام کرد هـەروەها لە سـالی ١٩٣١دا و ١٩٣٢دا شورشیان بەرپا کرد لە دژ حکومەتی عیراق و ئینگلیزەکان چونکە تە نگیان بـە بارزانیەکان هەلچنی بـو .

ئەم بنە مالەیە لە زەمانی شیخ تاج‌الدینی بارزانییەوە ناوبانگیان دەرکردوە بە تایبەتی لە زەمانی شیخ عبدالسلامی یەکەمدا ، پاش شەهید بونی شیخ عبدالسلام شیخ احمدی بارزانی برای بوە جـی نشینـی ، ئـەم بنەمالەیـە لە گـوندی « بارزان » دادەنیشن ، لەو وولاتەدا بەرەلاییە « مشـاع » ەبو هەموکەسـ خاوەن زەوی و زار نیە ، تەنانـەت شیخەکانیشـ بسـتیك زەویـان نیـە ، بە ناوی خویانەوە جوتیارو رەنجبەر زەویەکان لە ناو خویانا دابەشـ دەکەن وە دەیکیلن و کشـت و کالیان تیا دەکـەن ، دەرەبەگـی لەو وولاتەدا نیـە هـەر ئەمەشـە کە بوتە هـوی ئەوەی کە بارزانییەکان پەیوەندی دلسـوزی و سەر

شوری زوریان هەیە بەرامبەر بەشیخەکانو خویان دەکەن بەقوربانیانو گیانیان لە ری یانا بەخت ئەکەن ، بارزانیەکان زور لە سەر خون ، رەوشتو خەویان جوانو بەرزە زور راستنو درو نازانن چی یە ، دوو زمانیو دوو روویی وە داوین پیسی لە ناویاندا نیەو زور شوورەیی یە لایان ، سزای ئەم کردەوانە زور گرانە ، لە بەر ئەوە ئەم بارزانیانە هەمیشە بە سەربەرزی ژیاونو سەریان بو کەس دانانەواندوە لە بەر ئەوە بارزانیەکان سێ شورشی شیخ احمدی بارزانی دووەمیان لە سالی ١٩٤٣ وە تا ١٩٤٥ بە سەروکایەتی مصطفی بارزانی « ١ » وەسێیەمیان کە شورشی گەورەی ئیستایە لە سالی ١٩٦١وە بەرپا کراوە تا ئەمرو بە سەروکایەتی مصطفی بارزانی •

---

« ١ » لە پەرتووکی « بارزانی مصطفی کی یە » بە دوورو دریژی باسی بارزان ئەکەم کە ئەم زوانە لە چاپ ئەدریت •

نوسەر

## ★ جولانەوەی روشـــن بیری لە کوردســـتانا ★

لە ســـەرەتای ئەم چەرخی بیســـتەمەدا حەوت روژنامەو گوڤاری کوردی بە زبانی کوردی دەردەکـــرا ، چواری لە ئەستەموول ، ئـــەوانی تریشـــ لـــە قاهرەو بەغداد ، ئەگەر بیتو بە وردی هەنگاوەکانـــی روشن بیری کورد بخەینە پیش چاوو لیکی بدەینەوە ، ئەبینـــین کە لە دوای جەنگـــی یـــەکەمی جـــیهانی هەوارگـــای روشن بـــیری لە ئەســـتەموولو قاهرەوە گوازراوەتەوە بو عیراق بە تایبەتی بو بەغدادو ســـولەیمانی ، جا بویە ئیمە بە وردی دراســـەی بزوتنەوەی روشـــن بـــیری کورد بکەین ، هەر یەکە لە شـــوینو جیی خوباو بە تەنیا لە ، ســـوریە ، لە عـــیراق ، لە تورکیـــا ، لە ئیران ، لە یەکیەتی ســـوڤیتدا ، تا بـــە باشـــی بومان روون ببیتـــەوە روشن بـــیری لـــە چ رادەیەکا بوە لەو شوینانەدا

## *روشن بیری کورد له سوریه (۱) :ـ

ئەوەندە گرنگ نەبو لە پیشا ، تا سالی ۱۹۳۰ کە بو کوردەکان ئاشکرا بو کە باریکی گرانیان لە سەر شانەو ئەبی بیکەن ، ئەویش یەکخستنی هەستی کومەلایەتیە لە ناو کوردەکانا کە ئەمەش بە پاراستنی زبانو پیش خستنی روشن بیری کوردو بەهوی بەرز کردنەوەی ئەدەبی نەتەوایەتی‌یەوە دیتە دی ، ئەوانەی لەم بیرو باوەرەدا بون دوو برا « بەدرخانیە » کە بون بە تایبەتی میر « جلادەت بدرخان » لە سالی ۱۸۹۳دا لە شام « دمشق » جی نشین بو لەگەل میر « کامەران عالی بەدرخان »ی (۱) برایا بە جوتە گوڤاری « هاوار »یان دەرکرد بە کوردیو فەرەنسی ، یەکەم ژمارەی لە ۱۵ی ئایاری ۱۹۳۲دا دەرچو وە تا سالی ۱۹۳۵ مایەوە ، لە سالی ۱۹٤۱دا دیسان سەری هەلدایەوە تا سالی ۱۹٤۳ ، بەهەموی « ۵۷ » ژمارەی لی دەرکرا ، لە گەل ئەم گوڤارەدا ناوەروکیکی وینە دار « ملحق » دەرئەکرا ناوی « روناهی »و یەکەم کردەوەی جوانی نوسەرانی ئەم گوڤارە ئەوەبو کە بە پیتی لاتینی دەرهینراو پیتی ئەبجەدی بو دانرا وەك تورکەکان کردیان دووەم

---

« ۱ » لە نوسینی ئەم باسەدا کەلکی زور وەرگیرا لە « گوڤاری لیموندی فەرەنسی» کە لە بابەت کیشەی کوردەوە « جواس بلاو نوسی بوی .

نوسەر

کـردەوەی باشیان یەك خستنی لەهجـەی « کرمانجـی »بو لە بەر ئەوە لـەم بابەتەوە چەنـد پەرتووکیکیـان بلاو کـردەوە •

کاربەدەستانی حـکومەتی فەرەنسـەبە راسـتی دلسـوزانە یـارمەتی بـلاو کـردنەوەی روشـن بیری کوردیان دا لە سـوریەو لبناندا ، گوڤاری هـاوار نووسـەرو ئەدیبی زوری لی کوبووە ، لە گەل هونەرمەندانا وەك « مصـطفی احمد بوتی »و « قدرجان »کە هونەرمەندیکە وە ( عوسمان صبـری )وە مـەلا ئەحمدی حەیدەرانی لە هەموان بەناو بانگـتر « شـیخ موسی حسین »کە ناوی نهینی « جگـەر خوینـن » بـو •

★ ★ ★

---

« ١ » کامەران عالی بدرخان قورئانی پیروزی گوریوە بە کوردی لەگەل « ٧٠٠ » حدیث ، وە هەندی پیشینانی « سلیمان »ی لە سالی ١٩٤٧-١٩٤٩ کردوە بە کوردی وە ئینجیلی « لوقا »لە ١٩٥٣دا وە ئینجیلی « یوحنا »ی کردوە بە کوردی ، زور لـە هەندی پیشینانی فەرەنسیو ئەلمانی لە پاریس لە ١٩٣٧د کـردوە بە کـوردی لە گەل چیروکەکانی « لە و شای کوردستان » وە « بازی کوردستان » لە ١٩٥٣ ری زبانی کوردی چاپ کردوەو بلاوی کردوتەوە کە کردویەتی بە بناغەی دەرس وتنەوە لە « قوتابخانەی نیشتمانی زبانە زیندوە روژهەلاتیەکانا لە پاریس » .

لیموندی فەرەنسی

جواس بلاو

## * روشـــن بـــیری کورد لە عیراقدا :ـ

لە دوای تەواو بونی شـــەری یەکەمی جهانی لە ١٩١٩و١٩٢٠دا جولانەوەی روشـــن بیری کورد لە عـــیراقدا پیشـــکەوت ، ئەو بـــرا کوردانەی لە دەرەوەی عـــیراق ئەژیانو لە ئەستەمول بون هەموو روشـــن بیر بون لە بـــەر زورداریو ســـتەمی تورکەکان هەمو گەرانەوە بو کوردســـتانو لە دوو شـــوینی گرنـــگا جی نشـــین بون لە ســـولەیمانیو بەغداد

لە ســـولەیمانی روژنامەی « پیشـــکەوتن » لە ســـالی ١٩١٩تا١٩٢٢ دەرکرا وە « بانگی کوردســـتان » وە « روژی کوردســـتان » وە ( بانگـــی حەق ) وە « ئومیدی اســـتقلال » وە « ژیان » وە ( زانســـتی ) وە ( ژین ) دەرکـــرا وە روشـــن بـــیرانی کورد لە بەغدا « دیاری کوردســـتان »یان دەرکـــرد ، ئنجـــا « گەلاویژ » لە ١٩٣٩وەتا١٩٤٩وە « دەنگی گیتی تازە »وە ( نزار ) کە نـــاو بە ناو دەردەچو وە « خەبات » کە زبانی حالی پارتی دیموکراتی کوردســـتانی بـــو تا ســـالی ١٩٦١ کە قاسم دای خســـت ، گوڤاری « هیوا » مانگـــی جاریـــك دەردەکـــرا ، « دەنگی کوردســـتان » وە « رزگاری » روژنامەبو ، ( روناهـــی ) بە دوو هەفتە جاریك دەر دەچوو ، « ئازادی » زبـــانی حـــالی لقـــی شـــیوعی کوردســـتان بو لە رەواندز ، « زاری کرمانجی » دەردەکرا لە ئەربیل لە ١٩٣٦دا « هەولیر » دەردەکـــرا لە موصلیشـــی « راســـتی » ، ئـــەم هـــەمو گـــوتارو روژ نامانە هەموی بە لەهجەی ســـورانی دەزدەچون .

تیکەلیو هاتو چو کردن لە ناو ولاتە بیگانەکانی روژئاواو عەرەبدا بوە هوی فراوان کردنی ئاســـوی ئەدەبی کـــوردی ، کوردە روشـــن بیرە دلســـوزەکان

نوسـينه به نرخو جوانه‌كانى عه‌ره‌بو روژئاوايى‌يه‌كانيان ده‌كرد به كوردى ، وه زور په‌رتووكى زانيارى‌و گه‌شـتو گه‌ران به كوردسـتانا ، وه چيروكه خوشه به نرخه‌كانيان كـرد به كوردى‌و له چاپيان دانو بلاويان كـردنه‌وه ، لـيره‌دا ئه‌توانين ناوى زور له‌و نوسه‌ره به‌نـرخانه بينـين كه ده‌سـتى بـالايان بـوه به‌لام ئه‌ليـين له سـالى ١٩٥٨وه به ته‌واوى ئاسـوى ئه‌ده‌بـى كوردى رونالـك بووه ، روژنامه‌و چاپه‌مه‌نى‌و نوسـنيى نوسـه‌رانو ميژوو نوسان خرانه به‌رچاو له گه‌ل ريزه هونراوه رست كراوه‌كانى هونه‌رمه‌ندانا كه له‌م نوسينو هونه‌رانه‌دا هه‌ستى نه‌ته‌وايه‌تى به ته‌واوه‌تى ده‌ر نه‌ده‌بررا ته‌نيا له هه‌ندى رسته‌ى هونراوه نه‌ى

له پاشـى ١٩٥٨ كه سـه‌ربه‌ستى هه‌سـت پى‌كرا نوسـه‌رانى كورد كه‌وتنه ده‌ربـرينى ئه‌و ناسـوره پر له نيشـتمان په‌روه‌ريانـه‌ى كه بوبو به گـرى له سـه‌ر دلياناو په‌نـگى خواردبووه‌و پا چنـرابونه سـه‌ر يه‌ك ، له هه‌مو لايه‌كه‌وه گرى دل كـرايه‌وه‌و ناسـور ده‌ربرراو ده‌سـت كـرا به نوسـينو هونـه‌ر هونينـه‌وه به قه‌دو بالاى كومارى خوشـه‌ويستا « كومارى عـيراق » كه بـه كومارى عه‌ره‌بو كـورد درابـوه قه‌له‌م وه مافـى نا ته‌وايـه‌تى كورديشـى تيـا ئاشـكرا كـرابو وه روون كرابووه .

نوسـه‌ره كورده‌كان بـازوى پاله‌وانـى‌و چـالاكيان هه‌لكـرد چـاكى مه‌ردايه‌تيـان كـرد به لادا ده‌سـتيان كـرد بـه بـلاو كـردنه‌وه‌ى به‌رو بومى روشـن بـيرى يان ، ئه‌م سـه‌ربه‌خويى سـه‌ربه‌ستى‌و شـادمانيه تا شـه‌ره‌تانى ١٩٦١ى خايـانـد لـه عـيراقدا .

## * روشـن بـیری کورد له تورکیادا :ـ

باری روشـن بـیری کوردەکانی تورکیـا شـایانی دل تەنگیو گـریانە ، سـیاسەتی چـەوتو چەویلو شـوفینی کاربەدەسـتانی تورکیـا بەرامبـەر بە کـوردەکـان زور خـراپەو ئەیانەوی بیان توینەوە لە بوتەی تورکایەتیدا وە پێیـان دەلین « تورکی چیـا »ئەم سـیاسەتە چەوتـە بوە هوی خنکاندنی هەمـو جـورە هەولدانیـك لەم روەوە ، بەلام لە گـەل ئەم هەموو جـەورو سـزایەشا روشـن بـیری کورد هەر بـلاو ئەبیتەوە ، بی ئەوەی کاربەدەستانی تورکیـا هەسـت بکەن بـەم بزوتنـەوەیە ، چونکـە پەرتووکی خوینـدنو فـیر بوون بە دزیـەوە بـلاو دەکـریتەوەو دەخوینریـت ، بە پێی نوسینـی روژنـامەی « یەنـی ئەسـتەمول » لە ژمـارە « ٦ »ی تشـرینی دووەمـی سـالی ١٩٦٠دا نوسـیویەتی ئەلیـت :ـ

« پەرتووکی خویندنو فـیربونی کـوردی لە بەر دەرگـای مزگەوتـەکان بە دزیەوە دەفروشـریت لە دوای لە چاپـدانی لە عـیراق بە شـیوەی نهینـی دیتـە تورکیـــاوە » .

لە ئەیلـولی ١٩٥٩دا چـەند نوینەریـکی کـورد لە پەرلەمانـا بە یارمەتی دانی چەنـد روشـن بـیریکی کـورد داوایـان لە حکـومەتی تورکیا کـرد کە ریـیان بـداتی روژنـامەو گوڤـار بە کـوردی دەربینـن ، حکـومەت داخوازیـەکەی رەفـز کـردن ، لە گـەل ئەو رەفـز کـردنەشـا هیشـتا پەرتووکیکـی گورانـی بە کوردی لە « دیـار بەکـر » لە چاپـدرا نووسەر وە بلاوکەری ئـەم پەرتووکە دران بە دادگاه لە روژی لی پرسـینەوەدا « ١٢ »

پاریــزەر لە خویانــەوە هاتن بو دادگاە بو پاراســتنی خاوەن پــەرتووکەکەو نوســەری وە بەرگــری کــردن لی‌یان ، لە بــەر ئــەوە حکــومەت ناچاربو ســیاسیا وازی لە لێپرســینەوەکە هینــا •

روژنامەی « لیموند »ی فەرەنسی لە روژی ٢٦ کــانونی یــەکەمی ١٩٦٠دا نوســیویــەتی ئەلیــت : ــ

« یەنی ئەســتەمول » لە روژی ٦ تشــرینی دووەمی ١٩٥٩دا نوسیویەتــی ئەلیــت : ــ لە قوتابخــانەیەکی نهینــی کوردیــدا لە ناحیــەی « تەل جنوب » لە محــافظەی « ســعرد » بە دوری دە کیلو مەتر قوتابخانەیەکی نهینی هەیــە ئیمــە لە کاتی دەرســی وتنەوەدا حازر بویــن ، ئەو کەســەی کە ماموســتایی ئەکــردو دەرســی خــەتو نوســینی فــیری منــالە تــورکەکان ئــەکــرد ، منالەکانی فــیری نوســینو خوینــدنەوەی کــوردی ئەکــرد ، ئــەبجەدیەی کوردی عــیراقی بە کار دەهینا کە ئەم پەرتووکە کوردیە لە عــیراقەوە گەیشتوتە ئەم ناوچە دوورە ، بەهوی ئەو تەرجمانە وە کە لە گەل مانبو وە کوردی دەزانی لە گــەل ماموســتادا کەوتینــــە قســـە وەك ماموســتا باســی بو کــردین ، کومەلیکی نیشــتمان پەروەری کــورد هەن کە ئــەم ئیشــانە دەبەن بەریوە ، کوردەکان لە ژیــرەوە بە تووونــدی خەریکــنو خەبات ئەکەن •

## * روشــن بــیری لە ئــیرانا : ــ

کارو باری روشــن بــیری لە ئیرانا باشــن نیە ، حکومەتی ئــیرانیش هەر لە ســەر ســیاسەتی « تواندنەوە » رویوە بە ریگادا ، بەلام لە ســالی ١٩٥٩وە کاربەدەســتان هەســتیان بە تەنگو چەلەمەی گــەورە کــردوەو زانیویانــیە

ئەم سیاسەتە توندو تیژە داد نادا ، لە بەر ئەوە بایان داوەتەوەو ریگایان داوە بە دەرچونی روژنامەیەکی هەفتانە بە ناوی « کوردستان »ەوە لە « تاران » ئەم روژنامەیە لە یەکەم ژمارەوە دەستی کرد بە گورینی پەرتووکی « کوردەکان » بە کوردی لە فارسیەوە لە لایەن « احسان نوری پاشا »ی خەباتکەرو پیشەوای کورد کە یەکیك بو لە پالەوانەکانی شورشی « ئەگری داغ » « ئارارات » لە ۱۹۳۷دا ئەم روژنامەیە بە لەهجەی سوزانیو بە شیوەی زبانی « سنەیی » بە پیتی عەرەبی لە چاپ ئەدرا ، بلاو کردنەوەیو فروشتنی زور کەم بو ، وە لە ناوچەی کوردستانا نەدەفروشرا ، ئەم روژنامەیە لە نیسانی ۱۹۵۹دا دەرکرا لە ۱۹٦۱دا داخرا لە ئیراندا قوتابخانەی سەرەتاییو نیوەندیو ثانوی بە کوردی نیە ، بەلام کورسیەکی ماموستایی زبانی کورد لە دانشگای « تاران »دا هەیە « مەدام ئەریستوڤا » لە پەرتووکی « کوردی ئیران»دا نوسیویەتی ئەلیت :

تا سالی ۱۹۳٦ لە کوردستانی ئیرانا تەنیا قوتابخانەیەکی ئیسلامی بەولاوە ئیتر قوتابخانە بە کوردی نەبوە ، بەلام ئیستا لە « سەقز » قوتابخانەیەکی « ۹ » پولی هەیە وە سێ قوتابخانەی « ٦ » پولی سەرەتایی وە یەك قوتابخانەی سەرەتای کچان لە « مەهاباد » وە دوو ثانوی کورانو کچان وە قوتابخانەیەکی ناوەندیش لە « ئەشنو » هەیە ، « ٥ » قوتابخانەی سەرەتایی وە ( ۸ ) قوتابخانەی ناوەندی لە کرمانشاه هەیە ، بەلام کەمو کوریان زورە ، خویندن لەم قوتابخانانەدا هەموی بە فارسیە ، لە هەمو کوردستانی ئیرانا قوتابخانەیەك نیە بە کوردی دەرسی تیا بخوینریت •

## * روشن بیری له یەکیتی سوفیت :ـ

ژمارەی کوردەکانی یەکیتی سوفیت کەمە ئەگەر بەراوردیان بکەین لە گەل ئەو کومەلە کوردانەی لە ولاتەکانی تری روژهەلاتی ناوەراستا دەژین • لە گەل ئەو کەمیەشا ری‌و شوینیکیان بو خویان داگیر کردوە بەو وولاتەدا کە ئەمە شایانی شانازیە ، یەکیەتی سوفیت یەکەم دەولەتە لە خویەوە دانی ناوە بە نەتەوایەتی کوردا • بویە کوردەکان زبانیکی ئەدەبیان هەیە ، وە لە قوتابخانەکانیانا بە زبانەکەی خویان دەخوینن کە زبانی « کوردی »یە روژنامە نووسی‌و ئیستگەشیان هەیە ، بەم جورە روشن بیرانی کورد روژ بە روژ لە زیادین‌و ژمارەی داناو روشن بیران لە پەرەسەندنایە لە ئەرمینیا قوتابخانەی سەرەتایی‌و ثانوی هەیە ، لە جورجیاش هەیە ، لە مەعهەدی ئەرمینیا کورسی تەرخان کراو هەیە بو وتنەوەی دەرسی کوردی ، ژمارەی زور پەرتووکی خویندن بو قوتابخانەکان لە « یەریڤان » لە ئەرمینیا بە کوردی لە چاپ دراوە ، لەو پەرتووکانە نوسینەکانی « تی ، مارکولوف » وە « ئا ، درامیجان » لە سالی ( ١٩٣٦ )ەوە نوسەرە کوردەکان نوسینی خویان بلاو ئەکەنەوە ، وەك « ئەمین ئەڤدال » وە « و • نادری » •

لە جەنگی دوایی‌دا دوو پەرتووکی ریزبانی کوردی لە چاپ درا یەکیکیان هی « کی • کوردیف » لە یەریڤان ئەوی تریان هی « ئی•ئی •تسوکرمان » لە موسکو ، ئەدەبی کوردی لە سوڤیتا هەرچەندە تازەیەو لە دوای دانانی پیتی لاتینی بوە ، نوسینی زوری نوسەران‌و هونەرو چیروك‌و داستانی بلاو کردوتەوە •

له کونگـرەی خویندن کارانی کـورددا له ئـەوروپا ١٩٥٨ بـلاوکرابەوە له « ٣٠ » سـالی دوایـیدا نزیکـەی « ١٥٠٠ » پەرتـووك به زبـانی کوردی بـلاو کراوەتەوە له نوسـینی کوردەکانـی یەکیەتـی سـوڤیت ، ئـەوانەی شـایانی باسـن ئەمانـەن : ـ « عەرەب شامیلوف »وە « حاجی‌یه جوندی » وە ( لازو ) وە « تازك » وە « میراد » وە ( نادیـری )وە( سـیراس ) ئـەم پەرتـووکانه زوریـان له یەریڤـان له چـاپ دراون .

له سـالی ( ١٩٣٩ )وە له « یەریڤـان » گوڤاریـك دەرچو هـەفتەی دوو جـار دەردەهینـرا به ناوی « ریـا تـازە » وە له بەینـی سالی ١٩٣٩و١٩٥٤دا پەرتـووکی زور هەلبـژیرراوی باشـی دەرچو له نوسیـنی « جی . جلیل » له سالی ١٩٢٢دا له یەریڤان ئەبجـەدی زبانـی کوردیو ئەرمەنـی ریکخـرا به دەسـتکاری ، ئنجـا ئەبجـەدی لاتینی له سـالی ١٩٢٧دا دانـرا له لایەن « ئا . ئیسور مارکولوف »ەوە به کوردیو عەرەبی له لایەن « شـامیلوف »ەوە له سـالی ١٩٢٨دا ئـەم ئەبجەدی‌یه به رەسـمی به کـار هینـرا ، له سـالی ١٩٤٤و ١٩٤٥دا گورپرا به ئەبجـەدی « سـلاڤی » که پیـك هاتوە له « ٣٩ » پیتی بیدەنگ له لایـەن ئاکادیمیەی « کاپاکچیان »ەوە ، نوسینی « حاجـی‌یه جوندی » وە « کی . کوردوف »وە ئـەم پەرتـووکه ناونـرا « گراماتیکـا کـورد کوچو جازیکـا » لەم پەرتـووکەدا لیسـتەیەکی بـەراورد کـردنی بەینی « ٥ » ئەبجـەدی تیـایه کوردی ، عـەرەبی ، سـلاڤی لاتینی سـوڤیت لاتینی سـوریه ، لاتینی عـیراق ، له گـەل ئەمانەشـا له موسـکو وە لیننغراد زانـاو شـارەزایانی زبانـی کـوردی زورن وە پەیـوەندیـان هەیـه بـه دانشگاکانەوە ، رووس دوو زاناو میـژوو نوسـی گـەورەی هـەیـه کـه زور هـەولیـان داوە بـو بـلاو کـرنـەوەو دەرخسـتنی

میژووی کورد ، ئەم دو زانایە زوریان لە تەمەنی ژیانیان لە بەریتانیاو فەرەنسەدا رابواردوە ، « مینورسکی »وە « نیکیتین » •

لە فەرەنسە لە« پاریس » لە قوتابخانەی نیشتمانی دراساتی زبانە زیاوەکانی روژهەلاتا زبانی کوردی وە جغرافیا وە تاریخی کوردستان دەخوینریت ، ئەم بەشی کوردی یە لە سالی ١٩٤٥دا دامەزرا لە ژیر سەرپەرشتی کردنی « میر کامەران عالی بدرخان »داکە یەکیکە لە میرە ناودارەکانی بنەمالەی بەدرخان وە نیشتمان پەروەرو دلسوزەکانی کورد ، ژیانی خوی هەموو لە پیناوی خزمەتی کوردو کوردستانا رابواردوە •

هەروەها لە بیروت قەشە « توما بوا » کە ناوی نهینی لە نوسینەکانیا « لوسیان رامبوت »ە « ١ » لە چەند سالیك لەمەو پیشەوە خەریکی نوسینە لە بابەت ژیانی نەتەوەی کوردو ئەدەبو ئاینی کوردەوە لە لەندن مستر « سی • جی • ئەدموندس » کە عەمیدی مەرکەزی دراساتی روژهەلاتو ئەفریقایە لە گەل « کولونیل توفیق وەهبی بەگ » کە کوردیکی دلسوزە عیراقیە خەلکی شاری سولەیمانیەو لە « ١٩٥٨ »ەوە لە لەندەن جی نشینە ، ئەوانیش بە جوتە پیکەوە خەریکی نوسینن وە لەم دوایی یەدا فەرهەنگیکی کوردیو ئینگلیزی یان دەرکرد بە کوردی سورانیو تیپی لاتینی کە شایانی شانازیە •

---

« ١ » روژنامەی لیموندی فەرەنسی نوسینی « جواس بلاو »

مستر « ر • ن • مەکەنزی » جوتی پەرتووکی ریزبانی کوردی نوسیوەتەوە وە نوسینەکانی « جی • ئار • درایفر » « ۱ » زور پیویستە ئەوانەی ئەیانەوی باشس لە رەگەزی نەتەوەی کورد بگەن بی خویننەوە •

---

« ۱ » روژنامەی لیموندی فەرەنسی نوسینی « جواس بلاو »

# ئیمپراتوریەتی عوسمانیو کورد لە سەرەتای چەرخی بیستەما

لە کوتایی چەرخی نوزدەهەمو سەرەتایی چەرخی بیستا ئیمپراتوریەتی زلو پیری لەشس بە باری عوسمانی هیزو توانای تیا نەمابو ، پەکی کەوتبو ، ناریکی بەریوە بردنی کارو بار ، ناپاکیو چەوتیو نالەباری کاربەدەستان شیرینی رەوشتو خووی پاشاکانو دەستو پیوەندانیان ، وەك نەخوشی شیر پەنجەیە هەمو لەشس زلو ناقولای ئەم دەولەتەدا بلاو بوبووەو لە هەمو ئیسكو پوستو دەماری کاری کردبو ، وە خورەی ناپاکیو ناریکی رژیم لیی دابو دایرزاندبو ، لە هەمو لایەکەوە ئاژاوەو هەرا بلاو بوبووە ، ئەم دەولەتە زلە بەم جورە کەوتبوە گیانەلاوو لە سەرە مەرگا بو ، ئەمەشس بە تەواوەتی لە کاتی خلافەتی سلطان عبدالحمیددا رویدا چونکە خەلیفەیەکی زوردارو داوین پیسو خنکینەری هەمو جورە سەربەستیو سەربەخوییو دیموکراتیەتیك بو لە ولاتەکەیا ، هەمو دەستکەوتو سامانی دەولەتی بە فیرو لە بەرد ئەداو ئەیدا بە دەستو پیوەندە ناپاكو چەوتە بەدخوە دوژمنەکانی نەتەوە ، بو پاراستنی شوینو گیانو کورسی شایەتیەکەی ، کە لەوە بەولاوە هیچی تری بەیادا نەدەهات وە نەی ئەویست ، نەتەوەی بە هیچ نەدەزانیو نرخی نەئەدایەو بە چاویکی زور سوكو نزم تەماشای ئەکردن ئاگای لە

رۆوداوو کارو باری وولاته‌ که‌شی نه‌بو ، هه‌مو کارو باری خوی‌و وولات‌و نه‌ته‌وه‌ی دابوه ده‌ست چه‌ند که‌سیك له ده‌ست‌و پیوه‌نده تاوان باره‌کانی ، که ئه‌وانیش به ئاره‌زوی خویان ، ناپاکانه یاریان به پاشه روژی ئه‌ویش‌و وولاتیش‌و نه‌ته‌وه‌ش ئه‌کرد ، وه هه‌رچی له وولاتا رووی بدایاو بقه‌ومایا ، چاك‌و خراپ نه‌یان ئه‌هیشت ئه‌و بزانیت ، خویان له ناو خویانا ، هه‌رچی بیوایه دیزه به ده‌رخونه‌یان ئه‌کرد ، عبدالحمید به‌م جوره تاریکی‌و ناره‌وایی‌یه « ۳۳ » سال حکمر نی‌و خه‌لافه‌تی ئه‌م ده‌وله‌ته گه‌وره‌یه‌ی کرد که خاوه‌نی ئه‌و خاکه پانه‌بو عبدالحمید بو ئیش‌و کاری شخصی خوی‌و ده‌ستکه‌وتی خوی زور ژیرو وریاو زرنگ بو زور باش له‌وه گه‌یشتبو ، که له هه‌ر کاتیکا ئه‌و نه‌ته‌وانه‌ی ئیستا په‌یوه‌ندی سیاسیان به‌ستراو، به ره‌وره‌وه‌ی سیاسه‌تی تورکیاوه‌و پاشه روژی خویان به‌ستوه به پاشه روژی تورکیاوه ، هه‌مو بی جیاوازی ره‌گه‌زایه‌تی له ژیر ئالای خه‌لافه‌تی ئیسلاما ده‌ژین ، ئه‌مانه له چ روژیکا به ئاگا هاتن وه چاویان کرده‌وه‌و هوشیان هاته‌وه به‌رو له خه‌وی گرانیان خه‌به‌ریان بووه ، بی گومان ئه‌و کاته‌و ئه‌و روژه ، ئه‌ویش‌و ئیمپراتوریه‌ته‌که‌شی چه‌ند گه‌وره‌و فراوان بی نامینی‌و له ناو ئه‌چی ، چونکه له هه‌مو لایه‌کی وولاته‌که‌یا ده‌ست کرابو به بزوتنه‌وه‌و جولانه‌وه‌و ئاژاوه به‌رپابون به ته‌واوی له ناو نه‌ته‌وه « دیانه »کان که ئیسلام نه‌بون وه‌ك نه‌ته‌وه‌کانی نیوه دورگه‌ی « بالقان » زه‌نگی

دیموکراتیەت و سەربەخۆیی و ئازادی نەتەوەکان لە وولاتە روژئاواییەکانەوە دەستی کردبو بە لیدان زرنگەی بە گوزی و لە بەر خو وردە وردە دەگەیشتە وولاتە روژهەلاتیەکان و لە گوێی نەتەوە نوستوە ژێر دەستەکانا بە توندی دەزرنگایەوە لە خەوی گران خەبەری دەکردنەوەو رای ئەچلەکاندن و دەولەتە بیگانە روژ ئاواییەکانیش پەلیان بە هەمو وولاتەکانی روژ هەلاتا بلاو کردبووە دەستیان هاویشتبوە کارو باری ناوەوەو دەرەوەی وولاتەکانی تر بە تایبەتی ئیمپراتوریەتی عوسمانی ، تا رادەیەکی وا دەستیان کیشابوە کارو باری تایبەتی ناو کوشکی پاشاشەوە ، عبدالحمید وریا بو هەستی بەمە کردبو ، ئەیویست خوی لەم تەنگ و چەلەمەیە رزگارکا ، لە بەر ئەوە ئەگەرا لەو وولاتانەدا کە پەیوەندیان هەیە بە دەولەتی عوسمانیەوە ، کی ناو دارو دەسەلات دارەو دەرکەوتوەو بە روەوەیەو قسەی لە وولاتەکەیا بایەخی هەیە بی ئەوەی تەماشای چاکی و خراپی ئەو کەسانە بکا ، هەولی ئەدا ئەوانە لە خوی نزیک بخاتەوەو شوین و پایەی بەرزیان بداتی لە دەولەتا وە دەسەلاتیان زیاد بکا ، جگە لە دەسەلاتی خویان لە وولاتەکانیانا دەسەلاتی حکومەتیشیان بو زیاد بکا بو ئەوەی نەتەوەکانی ئەو وولاتانەی بو دەمکوت بکەن ، عبدالحمید بیری لەوە نەکردوتەوە ، ئەمە کوردە یان تورکە یان ئەرمەنیە یان چەرکەس

بی جیاوازی هەموی وەك یەك هاتوتە بەر چاو ، هەر وەها هەمو کەس توانیویەتی لە دەولەتا بگاتە بەرزترین پلەو شوێنی ئەگەر سلطان بیویستایەو ئارەزوی لی بوایە ، بەم جورە دەولەت گلولەی لە لیژی بو ، دەولەتە روژ ئاوایی یەکان ئەمەیان بە هەل زانی ، روسەکان ناوچەی « قارس و باتوم و ئەردەهان »یان برِدا بو خویان ، نەمساش ناوچەی « بوسنەو هەرسك »ی بو خویان برِدا ، یونانیش دەستیان گرت بە سەر « تسالیاو بیرە »دا ، هیزەکانی بەریتانیا « قبرس »و« مصر »یان داگیر کرد ، فەرەنسیەکان چونە خاکی « تونس »ەوە بەم جورە ئیمپراتوریەتی عوسمانی داغان کراو دابەش کرا ، ئەم کردەوانە لە وولاتەکانی دەرەوەی تورکیادا رویدا ، لە ناو خاکی تورکیاشا روژ بە روژ بار بەرەو خرابی ئەروی شت ، نەتەوە وەرس بون ، لەو کاتەدا لە ناوچەی « رومیلی »لە « سەلانیك » کومەلیك لە روشن بیران و لاوە تی گەیشتوەکان پیك هات بە ناوی کومەلی « اتحادو تەرەقی » یەوە دروشمی « سەربەستی و داد پەرستی و وەك یەك »ی یان هەلگرت و دەستیان کرد بە ئیش کردن و پرو پاگاندە بلاو کردنەوەو گەیاندنی بیرو باوری خویان بە خەلکی تر ، لەم کومەلەدا چەند ئەفسەریکی سەربازی بەشدار بون وە وردە وردە پەرەی سەندو سەرکردەو فەرماندەرە سەربازیەکان و پیاوە گەورەکانی دەولەت بونە لایەنگری

ئـەم گـومـەڵـەو بـون بـە ئـەنـدام وەك « هـادی پـاشـا عـومەری »و « محمـود شـوکت پاشـاو »و ( طلعـت پـاشـا )و ( جاوید بـەگ ) و « صـلاح الدیـن بـەگ » وە « نیـازی بـەگ » لـە ناوچـەی « سـەلانیـك » دا یاخـی بـون « ئـەنوەر بـەگ عـاطـف بـەگ »لـە نـاو چـەیـەکی تـرا ئەوانیشـس یـاخـی بـون ، بـەم جـورە بزوتنەوەو شـورشـس دەسـت پـی کـرا ، ئنجـا کومـەڵی « اتحـادو تـەرەقی » هوشـیار نـامەیەکیـان نـارد بـو « سـولتـان » داوایـان لـی کـرد ئـەگەر بـە زووتـرین کـات « دەسـتور »اعـلان نەکـا ئەسـتەمـوول داگـیر ئـەکـەن ، سـولتـان فـرقەیـەك سـەربـازی بە سـەرکـردەیی « شـمس الـدیـن پاشـا »نـارد بـو سـەر یـاخی بـوەکـان لـە « سـە لانیـك » « عـاطـف بـەگ » خـوی کـرد بـە پیشـمـەرگـە چـو بـەرەو پـیری « شـمس الـدیـن پاشـا »دەسـتەو یـەخـە گـرتی‌و کـوشـتی ، بـە کوشتنـی ئـەو هـەمـو ئەفسـەرو سەربازەکانی فـرقەکـە هاتنـە نـاو هیـزی شـورشـەوەو بونـە یـەك هـیز، ئنجا « ئـەنـوەر » وە « نیـازی »بـە سـوپاوە رویـان کـردە ئەسـتەمول لە روژی ۲۳ی تـەمـوزی ۱۹۰۸دا ئەسـتەموڵیـان داگـیر کـرد ، هـەمـوو وەزیـرو دەسـتو پیـوەنـدانی سـولتانیـان گـرت ، دەسـتوریـان اعـلان کـرد ، بـەم جـورە « اتحـادی »ی‌یەکـان حکمـرانیان سـەنـد

ئیتحـادیـەکان زور لـە خـویـان گوررانو کـەوتنـە خـراپـەو چـاویـان بـریە دەسـت کەوتـی خـویـان ، پـاشـس روژی ۱۳ نیسـان ۱۹۰۹کـە عبـدالحمیـدیـان دەرکـرد لـە خەلافـەتو « رەشـاد »یـان

دابە جی هێشتنی عبدالحمید بە تەواوی دەستیان کرد بە خراپە کردن تا گەیاندیانە رادەی کوشتنی ئەوانەی کە لە کردەوەو نەرداریان ئەدوان و نارەزاییان دەر دەبری ٠

کومەلی اتحادو تەرەقی دوای ئەو هەمو خراپەیە دەستیان کرد بە لیدانی زەنگیکی تارەو کوتایی دەهولیکی دراو ، دەهولی بزواندنی دەماری « جیاوازی رەگەزایەتی تورکایەتی و نەتەوەکانی تر ، کە دەفروشن پەنجەیەکی وەستایانەی بیمپرسایزمەکان بو حسیبانە ناوکارو باری ئتحادیەکانەوە ، ئەم دەستو پەنجە نهیینە لە ژیرەوە ئیتحادیەکانی ئەجولاندو هانی ئەدان لە نەتەوەکانی تر کە تورك نین و لە ژیر ئالای تورکدا دەژین ، وەك نەتەوەی عەرەب و نەتەوەی کورد ئیتحادیەکان بە هەمو هیزو تواناکانیانەوە کەوتنە نە دژبونی ئەم نەتەوانە کە تورك نین و جیاوازیان لە گەل دەکردن ، ئەم جیاوازی و جیاوازی کاریەو رەگەزایاتیە بوە هوی داچلەکاندن وەراچەنینی کوردو عەرەب ، هەستیان بوە کرد تورکەکان خویان لەوان بە خاوەن مال و زیاتر دەزانن و ئەمانیان لا بی نرخە ؛ بویە ئەوانیش نەوتنە خویان ، چونکە بە چاوی خویان دیان کە کاربەدەستانی حکومەت و کومەلی ئیتحادو تەرەقی لە هەمو شوینیکا بە توندی لە دژیانن ، تا لە مزگەوتەکانا تورکەکان خویان بە ئاغا دەزانن کوردو عەرەبیش بە نوکەر لە بەر ئەوە روشن بیرانی کوردو عەرەب بە گورجی راپەرین

عەرەبەکان لە لایەکەوە ، کوردەکانیشن لە لایەکەوە ،
روشن بیرانی کوردو چاکسی مەردایەتیان کسمرد بە لادا
لە ناو خویانا کومەلیان دروست کرد ، لەو کاتەدا نیشتمان
پەروەر « ئەمین عالی بدرخان » وە « فەریق شریف پاشای
سعید پاشا » وە شەهید « شیخ عبدالقادری شیخ عبیداللە نهری »
وە « مشیر داماد احمد ذو الکفل پاشا » « کومەلی پیشکەوتن و
سەرکەوتنی کورد » یان دروست کرد ، کەوتنە پشکنین
تا تورکەکان بلاوەیان پی کردن ، بەلام ئەوان وازیان نەهینا
بە شیوەی نهینی کومەلیکی تریان پیکەوەنا بە ناوی
« کومەلی بلاو کردنەوەی زانستی کورد » وە قوتابخانەکیان
لە ئەستەموول لە « چەمبەرلی داش » کردەوە ، ئیتحادیەکان
کومەلەکەو قوتابخانەکەیان داخست وە حوکمی اعدامی «شریف
پاشاو ئەمین عالی بدرخان » یان دا ئەمان زوو بە حوکمەکەیان
زانی رایان کرد بو دەرەوەی تورکیا ؛ .

لە سەرەتای سەدەی بیستەما تورکەکان خویان گالای
لە ناو بردنی « خەلافەت » یان هەلکرد ، هەروەها دوای
دروشمەسی کوچکەیی بەکەی شورشی دیموکراتی
ئەورپا کەوتبونو خستبویانە بەرگی دروشمەکەی خویانەوە
« سەربەستیو دادپەرستیو وەك یەك » ی وە هەروەهاشن لاوانی
نەتەوەکانی ژیر دەستیشیان کەوتبونە خو انو کەوتبونە جولەو
نمونەی شورشەکانی ئەورووپا بە تایبەتی شورشی فەرەنسەو

ئـەو شـورشـانەی دوای ئـەو جـولاندبـونی ، هەسـتی نەتەوایـەتی بە تـەواوی بـزوتبو ، بـە تایبـەتی لای كـوردەكـان ، لـەو كـاتـەدا لە ئەسـتەمـوول « خلیـل خەیالـی » كـرابو بـە بەریـوە بـەری قوتابخانەی « چەمبـەرلـی داشـں » هـەمـو شـەو قوتابیـە كـوردەكـان كـە لـە ئەسـتەموول دابـون كـوی دەكـردنەوەو دەرسـی كـوردایـەتـیو نیشـتمان پـەروەری دادەدان ، لـەو قـوتابیـانە « قـەدری بـەگ »و « ئەكـرەم جمیـل پاشـا » وە « ممـدوح سـلیـم » ٠

یـەكـەم كـومەلەی تـازەی كـورد « هیڤی ـ هیـوا » بـو « هیڤی ـ هیـوا » لـە سـالی ١٩٠٨دا بناغـەی دامـەزرا لـە ١٩١٢دا هـەرەتـی گـورجو گـولـی بـو تـا كـوتایـی شـەری یەكـەمی جهـان هـەر مابـو « خلیـل خـەیالی »ئـاگر خوشـكەرو ئیلهـام بەخشـی بـو ، ئەو سـێ لاوە چـالاكـەی سـەرەوە « قـەدریو ئـەكـرەمو مـەمـدوح » چـاكتـرین دامـەزرینـەری « هیڤـی ـ هیـوا » بـون ، كـومەلـی « خـوی بـون »یشـں لـە ١٩٢٧دا دامـەزرا ، ئـەوانـەی « هیـوا »یان دامـەزرانـد لەم كـومەلـەشـدا ئـەنـدام بـون ، لـەم خـەبـاتو جـولانەوەیەدا سـێ كـوردی دلسـوزی خـەلكـی سـولەیمانـی بـەشـدار بـون ، « مامـوسـتا اسـماعیل حـەقی شـاوەیسں ، كـاك عبـدالكـریم روسـتم كـە لـە سـولەیمانی بـە كـەریم « شـالـون » نـاسـراوە كـە شـاریكـە لـە فەرەنسـە ، وە كامـل حاجـی حسـن كـە بـە كامـل هـەورامـانی ناسـراوە » ٠

کـومەلـەی هیـوا لـە پیشـا کـومەلیکـی روشـن بـیری بـو گوررا بـە کـومەلیکـی سـیاسی ، لاوەکـانی هیـوا پـەیوەنـدیان بـوە بـە شـەهید شـیخ عبـدالقـادر شـەمـدینانیـەوە

# هاتنی سویند خواران بو ئەستەمولو باری سیاسی کوردستانی ژورو

کوردەکانو عەرەبەکان خەریکی جولانەوە بون تا جەنگی یەکەمی جهانی بە سەرا هات لە ١٩١٤ تا ١٩١٨ ، ئەوەبو ئەنجامی ئەو شەرە حکومەتی عوسمانی ژیر کەوت ، دەولەتە سویند خوارەکان جەنگیان بردەوە لە ١٩١٨دا پەیمانی « موزدروس » وەستاندنی شەر لە سەر کەشتی « ئاگا ممنون » مور کرا لە روژی ٣٠ ئەیلولی ١٩١٨دا سویند خواران هاتنە ئەستەمول تووشی دوو گیرو گرفتی سیاسی گەورە بون بە هوی ئەو بەلینەوە دابویان بە « ئەرمەنی »یەکان کە حکومەتیکی ئەرمەنیان بو دروست بکەن سنووری هەر لە کەناری دەریای « قەزوین »ەوە دەست پی بکا تا دەگاتە دەریای « رەش » وە بەرەو خوار بیتەوە لە روژ ئاواوە بەرەو کەناری دەریای « سپی ناوەراست » هەموو وولاتی « ئەنەدول »و ( سیواس )و « ئەرزوروم »و « خەرپووت »و ( دیار بەکرو )و ( بدلیس )و( وان ) بگریتەوە ، جا دیارە لەم ناوچانەدا زوربەی زوری دانیشتوان هەمو کوردن ، کوردەکان لەم بەلینە داچلەکین وە مەترسیان پەیدا کردلەوەی کەسویند خوارانلایەنگری ئەرمەنیەکانبکەن وەمافیکوردەکان بدەن بە ئەرمەنیەکانو لە دوا روژا بیان خەنە ژیر چەپوکیانەوە لە بەر ئەوە روشن بیرانی کورد ، بە گورجی کەوتنە خویانو بو گەیشتن بە ئامانجی نەتەوایەتی .

گیرو گرفتی دووەمیان گیرانەوەی ئاثوریەکان بو نیشتمانە کەی خویان ، ئەم دوالەشس هەردوکیان لە سەر حسابی کورد ئەبوایە جی بە جی بکرایە ، گیرو گرفتی یەکەمیان زور ئالوزو گرنگو فراوان بو گیرو گرفتی سیاسی گەورەی بە دواوە بو چونکە بی تیبینی سویند خواران لەوەدا بو کە شارەزایی سیاسیان تەبوە سەرامبەر بەو ناوچەیەی ئەم بەلینە سەر پیٚیەیان لە سەردابو ، بی ئەوەی ئەم بابەتە دەرسس بکەنو نەخشەی بو بکیشنو بە تەواوی لە هەر چوار لایەوە بە قوولی دەرنی بکەنو لەوە بگەن ئایا ئەتوانن ئەم بەلینەبەربە سەرو بچەسپینو ئایا هەر وا ئاسانە یان نە ؟ •

ئەرمەنیەکان دەستیان کرد بە پرو پاگاندە کردنو دەربرینی بیرو باوەریان کە نیازیان وایە دەولەتیکی ئەرمەنی گەورە دامەزرینن کە سنوریکی فراوانی ببی ، بەرامبەر بەم جولانەوەی ئەرمەنیەکان ، روشن بیرانی کورد سلەمینەوەو کەوتنە خویان کومەلە نیشتمانیەکانی کورد لە ئەستەمول بە سەروکایەتی « عبد القادر شمدینان » لە گەل بەدرخانیەکانا داوایان لە « هیئەتی دەولەتان » کرد کە لە ئەستەمولا بون کە « هەمو ناوچەکانی کوردستان بکەن بە یەکو وە حوکمی زاتی « خود مختاری »بدەن بە کوردەکان » وە هەروەها دەنی لیژنەکانی دەولەتان وە ئەمریکایان کرد کە پیك هاتبو بو وەرگرتنی دەنگ لە نەتەوەکان کە لە دەولەتی عوسمانی جیا بوبونەوە •

داخـوازیەکانـی خویـان بەوانیشـس راگەیـاند ، لـە کانونـی دوومی ۱۹۱۸دا لـە « مصـر » کومەلیکـی نیشتمـانی کـورد پیـك هـات ، داوایـان لـە بەریتـانیا کـرد کـە یارمەتیـان بـدا بـو دروسـت کردنی حکـومەتیکـی سـەربەخو ، وە روژنامـە یەکیشـیان دەرهینـا ، لـەم کاتـەدا کونگـرەی ئاشتی لە پاریس گیرا هەمو سەروکی کومەلەکانی کورد پیکـەو کوبـونـەوە ، بـریاریـان دا « شـەریف پاشـا »یـان کـرد بـە نوینـەری هـە مو کـورد ، « شـەریف پاشا » لـەو کاتـەدا لـە پاریس بـو ، داوایـان لـی کـرد بکـەویتە گفتـو گـو کـردن لـە گـەل دەولـەتە سـویند خـوارەکانا بـو تـەواو کـردنی بـراندنـەوەی بابەتی سـەندنی مافـی نەتـەوایـەتی کـورد لـە کونگـرەی ئاشـتیدا ، « شـەریف پاشـا » لـە روژی ۲۲ی ئـازاری۱۹۱۹دا یادداشـتیکـی بـەم ناوەوە دا بـە ئـەنجـومەنی دەولـەتان داوای ئـازادی‌و سـەربەخویـی کـوردسـتانی کـرد ، وە داوای کـرد هـەمو نـەتەوەی کـورد بینـە یـەك لـە ژیـر ئالایـەکا ، وە هـەر لـەو کاتەشـا « شـەریف پاشـا » خـوی گەیـاندە کـومەلەکانـی « ئـەرمەن » بـو دوان لـە گـەلیانابـو لابـردنی ناکوکـی لـە بەینـی کـوردو ئەرمـەنیـدا ، لـە تشـرینی یـەکەمی ۱۹۱۹دا لـە گـەل نوینـەری ئـەرمەنیەکـان « بوغوس نوبار پاشـا »دا ریـك کـەوت لـە سـەر ئـەوەی وولاتـی کوردسـتان سـەربەخـویی جیابـی لـە وولاتـی ئـەرمەنیـا کـە سـویند خـواران نیـازیان وایـە دروسـتی بکـەن ، لـە روژی ۱ ازاری ۱۹۲۰دا هـەردوو نوینـەری کـوردو ئـەرمەنی پیکـەوە یـادداشـتیکیـان دا بـە ئەنجومەنی

دەولـەتان ، پێیـان راگـەیانـدن کـە هـەردوو لایـان واتـە کـوردو ئـەرمەنی رێـك کـەوتون لـە سـەر ئـەوەی کـە کـورد بـە جیـا وە ئـەرمـەنی یـە جیـا سـەربەخـۆیی خۆیـان بـبی ، ئەنجـومەن لـە سـەرەتاوە بـەم یـادداشـتە قایـل بـو ، ئەمـە لەولاوە، لـە تورکیاشـدا کوردەکـان تـەواو بـاوڕیان نـەما بـە دەولەتـە سـوێند خـوارەکان وە بـیرو بـاوریان گـوررا بـەرامبـەر بەریتـانیا ، بەهـوی ئـەم بـی بـاوریەوە کوردسـتان بـە جارێـك بـوە زەویـەکی پوخـتەو بـەپیت بـو چانـدنو بـلاو کـردنەوەی تـووی پـرو پـاگانـدەو درۆو دەلەسەی تورکەکـانو بـاور پی کـردنی ، بـە تـەواوی درێـژە دان بـە مـاوەی دورو درێـژی بـە « موتـارەکە » وەسـتاندنی شـەرو پەیمـانی ئاشـتی ئەمـە بـوە هەلیکـی گـەورە بـو تورکەکـان کـە کەلکـی گـەورەی لـی وەر بگـرن ، وە دەرکـەوت کـە بـە کـردەوەشـی کەلکـی گـەورەیـان لـی وەرگـرت .

لـە بـەر ئـەوە سـیاسەتی بـەریتانیـا لـە تـورکیادا تووشـی زنجـیرەیەك گـیرو گـرفت هـات بـە تایبـەتی کـە دەسـتی تێکـەلی یان درێـژ کـرد بـو کـوردەکان ، رستـە تعصبیکـی نەتـەوایەتی تـوند لـە بـەردەمیانـا ریـز کـرا ، وە بـزوتنەوەو جـولانـەوەیەکی بـە هیز بـە هەمـو ناوچەکـانی کوردسـتانی زۆرودا بـلاو بـویـوە ، لـە گەل ئـەو سـلەمینەوەیەدا کـە باسـی کـرا ، جـا بـو تاقی کـردنەوەی ئەم مەترسـیو سـلەمینەوەیە لـە بەریتانیـا « مسـیر مـارك سـایکـس » کـە لـەو کاتـەدا لـە « حلـب » بـو تەتەریکـی تایبـەتی خـوی ناردە

لای کوردەکانی « طور عابدین » لە ناوچە شاخاویەکەدا کە کەوتوتە ژوروی « نصیبین »ەوە تا لەو بابەتە بکا کە ئایا ئام کوردانە لە دژ بەریتانیانو لە بابەت نەهیشتنی ناردنی ئازووقە بو « علی احسان پاشا »ی تورك ، تەتەرەکە بوی دەرکەوت کە لەوێ کومەلیکی گەورە هەیە حەز بەوە ئەکەن بچنە ژیر بالی بەریتانیاوە بەو مەرجەی سەربەخویی‌یان بدریتێ

کوردەکانی « زعرت » کە « ٧٥ » میل لە خواروی روژ ئاوای گولی « وان »ەوە دورن هیزەکەی حکومەتی تورکیایان دەرکرد ، وە هەر وەها لە « باشقەلا » کوردەکان جولانەوەیەکی سەربەخویی‌یان کرد ، « شیخ محمودی میللی » کە سەرەکی خیلی « مللی » بو لە روژهەلاتی « اورفە » لە بەندخانەی تورکەکان رای کردو دەستی کرد بە جولانەوە ، بەلام هیچی‌ پونەکرا .

لیژنەی سەر بەخویی کورد وە یانە کوردەکان لە دیار بەکر کەوتنە خو کوکردنەوەو جولانەوە لە گەل « پارتی نەتەوایەتی کورد »دا هەمو بونە یەك لە دژ بەریتانیاو دژ ئەو بەلینەی دابویان بە ئەرمەنیەکانو ئاثوریەکان .

بە بونەی دل گرمی بونی کوردەکان لە بەرتنانیاو بیوبند خواران ، وە بەهوی بلاو بونەوەی پرو پاگەندەی زوری تورکەکان وە بزواندنی دەماری مسولمانەتی لە ناو کوردەکانا توانیان حزبیك پیك بینن بە ناوی « حزبی یەکیەتی ئیسلام »ەوە کە

پروپاگانده بو تورکەکان بکەن . لەم کاتەدا « مبجبەر نوئیل » « ۱ » ناو کە ئەفسەریکی بەریتانیایی بو بە تایبەتی دەگاتە « نصبین »و «دیار بەکر » لەویوە راپوریک ئەدات ئەلیت بیستا لە ناو کوردەکانا دوو حزب هەیە ، حزبی « یەکیەتی ییسلام » کە ئەمانە بە تەواوەتی لە دز بەریتانیاو سویند خوارانن وە حزبی « یەکیەتی کورد » کە مەبەستیان سەربەخویی کوردو کوردستانە ئەم حزبە لە دز بەریتانیا نیە بەلام لە بەریتانیا دەستەلەمنەوە چونکە وا ئەزانن کە بەریتانیا نیاری وایە حکومەت بو ئەرمەنیەکان دروست بکا بو ئەوەی ئەرمەنیەکان تولەی کوشتارەکەیان لە کوردەکان بسەندنەوە ، وە ئەلیت : ـ « باسی باوەردکانی سەرەك ولسن کە وتویەتی هەمو کەس سەربەستە چی ئەوی بیکا » .

کوردەکان ئەمەیان حرفیا وەرگرتوەو لە بەریان کردوەو داوای مافی نەتەوایەتی پیوە ئەکەن وە ئەمەشیان بوتە هوی سەر لی شیواندن لە بەریتانیا ، چونکە کوردەکان وا دەزانن ئەگەر ئەوان بە دەنگی بەرز ئەم داوایانەیانا کردو هاواریان کرد

---

« ۱ » تأریخ العراق الحدیث « مسس بیل » ترجمە جعفر خیاط .

سەرەك ویلسن « ۱ » لەویوە گوێی لە دەنگیان دەبیست وە ڕێگایان ئەداتی چیان ئەوی بیکەن .

بەریتانیایی‌یەکان چونکە نیازی چاکەیان نەبو لە گەل کوردا یانەی کوردەکان لە دیار بەکر بوبوە چقل ئەچو بە چاویانا ئەم یانەیە کە هەولی ئەدا بو یەکیەتی‌و سەربەستی کورد دایان خست ، ئەندامەکانی گیران ، « جەنرال ئەلەبنی » فەرماندەری گشتی هیزی بەریتانیا لە عیراق فەرمانی دا بە « میجەر نوئیل » لی بوردنی گشتی دەرکا بو کوردەکان لە والایەتی موصلدا ، وە ئامۆژگاری‌و رابەری پێویست بلاو کاتەوە بە ناو کوردەکانا ، بەریتانیا سێ ڕێی خستە بەر چاو : ـ

۱ ـ ئەوەیە کە گوێی نەدەنە ئەو شتانەی روو ئەدەن لە دەرەوەی سنوری دەسەلاتیان .

۲ ـ دووەم هوی دەسەلات پەیدا کردنیان ئەوەبو دەستیان کرد ریکخستنی هەندی گیرو گرفتی کە ئەویش ئەوەی لە بارا نەبو وە نەشی ئەویست بیکا .

---

« ۱ » تاریخ العراق الحدیث « مس بیل » ترجمه جعفر خیاط .

بەو نوسینەدا دەر دەکەوی کە ئینگلیزە داگیر کەرەکان گالتەیان بە بەلینەکانی « سەرەك ویلسون » کردوە وە نیازی چاکەیان نەبوە بەرامبەر بە کورد .

ـ نوسەر ـ

٣ ـ گەلك وەرگرنی لە کوردەکان کە حەز ئەگەن لە گەل بەریتانیا دابن

حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغداد ئومیدی بە سێیەمیان هەبو چونکە ئومیدی ئەکرد بەو هویەوە یار بە باشی بگەری لە بەر ئەوە بەریتانیاش کە زانی باری سیاسی لە کوردستانا زور شلوقەو کەوتوتە تەنگو چەلەمەوە بریاری دا دەسەلاتی ئەرمەنیەکان لە ناوچەی کوردستاندا نەهیلریت ، ئەمەش گەیەنرا بە لەندەن ، لە پیش ئەوەدا جوابی لەندەن بیتەوە « سید طە »ی شەمدینانی گەیشتە بەغداد ، هاتنەکەشی لە کاتیکا بو کە لە سولەیمانی ئاژاوە دەستی پێ کردبو مەبەستی « سید طە » لەم هاتنە لەو کاتەدا قایل کردنی بەریتانیابو بو دامەزراندنی کوردستانیکی گەورە لە ژیر چاودیری بەریتانیادا ، لەم یەکیەتی‌یەدا کوردەکانی ئیرانو تورکیاو عیراق بەشداربنو ببنە یەك ، بەریتانیا بە ئاشکرا وەلامی « سید طه »ی دایەوە کە پروژەیەکی وا گەورە لە توانای بەریتانیادا نیە بیکا . « سید طە » زور دلگیر بو ووتی « بێ گومان بزانن کە ئەم کوردستانە هەر ئەبیت جا ئیوە پیکەن یان نەیکەن » .

ئینگلیزەکان کە زانیان ئیشیان لە سولەیمانیدا زور شلوقە بەهوی شورشو هەرای شیخ مەحمودەوە ، وەکیلی حاکمی گشتی بەریتانیا لە عیراق نامەیەکی بە زبانی فارسی نووسی بو «سید

طـه »و دایـه دەسـتی . نامەکە ئەمەی تیابو ئەلیـت : ـ

« حکـومەتی خـاوەن شـکوی بەریتانیـا دەسـەلاتی داومـی نـه دل نیاتـان بکـەم لـەوەی کـه نایـەویـت سـیاسەتی تولـه شـەندن بەکار بێنیـت بـەرامبەر بـه کوردەکـان لـه سـەر ئـەو لـەردەوانـەی کـردوبـانه لـه مـاوەی جەنگـا ، وە ئامادەیه لـی بوردنـی گشـتی دەرکا وە هەروەهـا ئـەم لێبوردنه نایێتـه هـوی ئـەوەی کـه هـەول نەدان بـو ئاشـت کـردنەوەی حکومەتیەکـانو کـوردەکان لـه گـەل یەکـا بو ئـەوەی پیکـەوە بـه ئاشـتی بـژین ، وە بابەتـی زەوی و زاریشـی کـه لـه بەینیانـدا هەیـه هەمـوی ریـك دەخـریت ، بی ئـەوەی پیویسـت بکـا بـه دەسـت دانـه چـەك ، وە هەروەهـا دل نیابـن لـەوەی بەریتانیا چـاو لـه مافـی نەتـەوایەتی کـورد ناپوشـی لـه کونگـرەی ئاشتی دا ویـنه یەکی ئـەم نامەیـه نیررا بـو « میجـەر نوئیـل » لـه کوردسـتانی ژورو کـه ئەویشـی بەیانیکـی بـه هەمو ناوچەکانی کوردستانـاکـه لـه ژیر دەسەلاتیایەتی بلاو کردەوەو ئەلیت پاشه روژی ئەو ولاتەی که به ئەرمەنیا یان بـه کوردسـتان نـاو دەبـریت ، ئەمه بابەتیکـه کونگـرەی ئاشـتی دەی بیسـت ، گومان نیه لەوەدا که کونگـرەی ئاشتی بـریارەکانی ئـەدا له سـەر ئـەو بـیرو بـاورانەی که لەوە پیش بـلاوی دەکـردەوە ئەویشـی « نەتەوە مافی ئەوەی هەیە خوی چ جورە فەرمان رەوایی‌ەکی بوبیت وادای بیت» هەر لـەم کاتەدا « اسـماعیل ئاغـای سـمکو » ئەویشـی نـامەیەکـی

ناردبو بو وەکیلی حاکمی سیاسی گشتی بەریتانیا بە عیراق کە لە پیشی جەنگەوە ناسیاویان بوە پیکەوە ، سیکالای کردەبو لە دەست کاربەدەستانی ئیران ، بەلام بەریتانیا لە بەر ئەوەی کە پەیمانو دوستایەتیە بوە دولەو روا لە سەر ریی یەك خستنی کوردستان وە بوە گری بو دانی مافی نەتەوایەتی بیە کا ورد .

بەم جورەو لە بەر ئەم هویانە بەریتانیاو ناوی بەریتانیا تەواو رەش بو لای نەتەوەی کورد ، لە هەر شوینیکا ناوی بەریتانیا بهاتایە کوردەکان دەسلەمینەوەو دادەچلەکین ، ئەم بەد ناویەی بەریتانیا بوبوە تەمو مژیکی توندی سیاسی کشا و بە سەر هەمو ناوچەکانی کوردستانا ، وە بوە هوی خراپ بوونی پەیوەندی لە بەینی کوردەکانی ناوچەی ژوروی موصل وە هوی روداوەکانی « عمادیە »و « عەقرە » ئەوەبو کە بەریتانیا بەهوی هیزو توانایەوە بە زورو زورداری ئەیویست کە ئاثوریەکان بگیریتەوە بو شوینەکانی خونان لە شاخەکانی «تەیاری» کە نزیکترین ریگا بو گەیشتن بەو شاخانەو ئەو ناوچەیە لە « عمادیە »وە تی دەپەری لە بەر ئەوە بەریتانیا هیزیکی سەربازی نارد بو شوینیك کە چورا میل لە « عەمادیە »وە دورەو معاونیکی حاکمی سیاسی تعین کرد بو « عەمادیە » ، کوردەکان کە بەمەیان زانیو زانیان بەریتانیا نیازی خراپەو ئەیەویت سەربەخوی کوردەکان بخاتە ژیر دەسەلاتی «ئاثوری» یەکانەوە ، لیی راست بونەوەو هەراو ئاژاوە دەستی پی کرد

بەریتانیا ناچاربو گەواز لە گەرانەوەی ئاشوریەکان بێنیت ، کوردەکان کە رقیان هەلسابو وازیان نەهێنا معاونی حاکمی سیاسی عەمادیە « کاپتن ویلی »و ملازم « ماکدونالد »و چاوەش (تروب) لەگەل دوو کاتبی هندیدا کوژران ، ئەم کردەوەیە خۆ پیشاندانێك بو کرا بەرامبەر بە نیازە خراپەکەی بەریتانیا .

لە روژی ۲۹ی مارتی ۱۹۱۹دا تەتەرێکی کورد گیرا لە لایەن ئەوانەوە کە سەر بە بەریتانیا بون ، تەتەرەکە چەند نامەیەکی « عبدالرحمن ئاغا »ی سەروکی کوردەکانی « شەرناخ » کە کەوتوتە ژوروی روژهەلاتی « جزیرەی ابن عمر »ەوەی پی بو لەم نامانەدا داوای لە کوردەکان کردوە کە بیگانەکان دەرکەن لە کوردستان چونکە نیاز وایە دەولەتێکی کوردی سەربەخو دروست بکریت ئەم جولانەوەیەش لایەنگری دەکریت لە لایەن حکومەتی تورکیاوە لە ئەستەمولو پاریسو قاهرە نوینەرانی کورد خەریکی دامەزراندنی ئەم دەولەتەن « ۱ » .

★★★

---

« ۱ » تارخ العراق الحدیث « مسس بل » ترجمە جعفر خیاط .

# هـاتنی بەریتانیـا بـو کوردسـتانی خـوارو

لـە پاشـی بـلاو کـردنەوەی دەسـتور لـە ١٩٠٨دا لـە تورکیـا ئیتحادیـەکان تەواو دەسـتیان دایـە خـراپـەو نارەوایـی کـردن ، حکومـەت دەسـەلاتـی نەمـا لـە هەمـو لایـەکا لـە ناوچەکانـی دەولەتی عوسـمانیدا ئاژاوەو هەرا دەسـتی پـی کـرد ، بـە تایبـەتی لـە عـیراقدا وە لـە کوردسـتانا ، تورکەکـان دەسـتەلاتیـان نەبـو بـە سـەر خیلـە کـوردەکـانا ، لـە بـەر ئـەوە لـە دوای گـرتنی بەغـداد لـە لایـەن سـوپای بەریتانیـاوە یەکسـەر بەریتانیـا کەوتـە خـو گەیانـدن بە خیلە کوردەکـانو سـەروکەکانیان ، وە لـەم کاتـەدا نەتـەوەکان هـەمو تینوی سـەربەخـویی‌و خـود مختـاری « حکمـی ذاتـی »بـون وە ئـەم داوا کـردنـە بـو بـە دروشـمو هەلکـرا لـە لایـەن نـەتەوەکانـەوە بە تایبـەتی نـەتەوەی کـورد ، کوردەکـان بـە شـیوەیەکی زور هیمـنو نـە سـەر خـو ئـەم داخوازیەیـان دەکـرد چونکـە نەیـان ئەویسـت ئـاژاوە بنینـەوە لـە گـەل ئەوەشـا کـە حکـومەت لـەو کاتـەدا ئـەو هـیزو توانایـەی نەبـو دەسـت بوەشـینی ، لـە بـەر ئـەوە لـە ئـەوە لـە سـنوری ئـیرانا شـورش بـەرپا کـرا هـەر لـە ١٩١١وە تـا ١٩١٣

لـەو کاتـەدا خیلـی « هەمەوەنـد »و « جـاف » لـە بەشـی خوارەوی زیی چوکـا دەژیـان ، هەمەوەندەکـان نیشـتەجـی بـون ، جـافەکان کوچـەری بـون لـە بەشـی لای [illegible]پی دیـالەوە ئەرویشـتن تا «مەریوان» لـە ئـیرانا هەروهـا «باجـەلان[illegible]ـەکان کـە نیوەیان لـە ژیـر دەسەلاتی

ئێراندا بون سەروکی ئەوانەی لە ژێر دەسەلاتی تورکیادا لە دەورو پشتی « خانەقین » دەژیان ناوی « مصطفی پاشا » بو لە شاری « خانەقین » دادەنیشت یەکە پیاوی سیاسی ئەو ناوچەیە بو لەو روژەدا •

تورکەکان ناکوکیەکی گەورەیان خستبوە بەینی هەمەوەندەکان‌و بەرزنجەیی‌یەکانەوە ، « شیخ سعید » سەروکی بەرزنجەیی‌یەکان بو کە بنەمالەیەکی ناودارو ئایین پەرستن لە سولەیمانی‌دا بەهوی کاکە ئەحمەدی شیخەوە کە پیاویکی پیروزو ناو دار بو ، بەرزنجەیی‌یەکان ناویکی ئاینی‌و کومەلایەتیان هەبو ، شیخ سعید پیاویکی هەلکەوتو وە ناسراو بو ، ئاثیری هەبو لە سەر ئاسایش لەو ناوچەیەدا وە ناویکی پیروزی هەبو ، لە ناوەراستی چەرخی نوزدەهەما حکومەتی عوسمانی ویستی بەراستی دەسەلاتی خوی بچەسپینی بە سەر کوردەکانا کە بە توندی داوای ئازادی‌و سەر بەخویی‌یان دەکرد ، تورکەکان لەوە گەیشتبون کە ئەم داوا کردنەش لە سەروکەکانیانەوەیە چونکە هەمو دەسەلاتدارن‌و چەکی زوریشیان هەیە • لە بەر ئەوە حکومەت هیچی بو نەدەکرا بەرامبەر بەم دەرەبەگانە ، بویە تورکەکان بە سیاسەت لە گەل ئەو سەروکانەدا دەجولانەوە « یەکیکیان هان ئەدا لە دژی یەکیکی تریان‌و دەیان کردن بە گژ یەکاو کاریکی وایان ئەکرد کە یەکیکیان زەبون بی‌و بکەویتە ژیر دەستی ئەوی تریان یان بکەویتە ژیر دەستی خویان تا لە ناویان بەرن وە

هەندیکیشیان بە پارە دەمکوتو سەر شور دەکردن وایان لی نەکردن نەتوانن سەر هەلبرن ، بەم جورە تورکەکان توانیان بنەمالەی بابانی سولەیمانی لە ناو بەرن لە کوردستانی خواروودا بەم جورە خاکی بابانەکان کەوتە ژیر دەسەلاتی حکومەتی تورکەوە » •

لە کوردستانی ژوروودا تورکەکان بەدرخانەکانیان لە دوورگەی بن عمرەوە هینا بو ئەستەمول ، وە عبدالقادر شمدینانیان دور خستەوە ، وە پشتی ابراهیم پاشای میللیان بەردا لە روژهەلاتی « حلب »و دوژمنەکانیان لی هاندا بو پارچە پارچە کردنی ، چونکە سوپای عوسمانی هەرگیز نەیتوانیوە دەسەلاتی خوی بچەسپینی بە سەر کوردەکانا ، ئەگەر نیازی کردنیشی بوبی تیا سەر نەکەوتوە ، بویە تورکەکان هەر بە سیاسەتی پر لە فرو فیل کوردەکانیان بردوە بە ریوەو بە سەر انا زال بون •

# هاتنی ئینگلیز بو شاری سولەیمانی

دوا میری بابان لە سولەیمانی « عبداللە پاشا »ی بابان بو تورکەکان والیەکی تازەیان نارد بو سولەیمانی ناوی « نجیب پاشا » بو ئەم والیە پیاویکی زور خراپ بو هەمیشە خەریکی ناکوکی بلاو کردنەوە بو لە ناو میرەکانی باباندا وە سیاسەتی « فرق تسد » « جیا کەرەوەو سود وەرگرە »ی لە گەلدا بە کار دەهینان‌و هەمیشە دوو بەرەکی‌و ناکوکی ئەخستنە ناوەوەو بو ئەوەی زبونیان بکاو میرایەتیەکەیان وردە وردە لە ناو بەریت ، لە بەر ئەوە داوای لە عبداللە پاشا کرد کە ئەبی هیزیك سەربازی تورك بین بو سولەیمانی‌و باجی میریش زیاد بکا ، وە عبداللە پاشای کرد بە قائمقامی سولەیمانی ، بەم جورە چوار سالی بردە سەر لە سالی ١٢٦٧ك دا والی « نامیق پاشا » ناو لە بەغداد عبداللە پاشای بانگ کرد بو بەغداد ، لەویوە بە دەست بەستراوی ناردی بو ئەستەمول میر لوایەکی تورکی ناردە شوینەکەی ، بەم جورە میرایەتی بابانەکان لە سولەیمانیدا کویر بووە لە دوای « ١٥٠ » سال حکمرانی کردن بە تەواوی لە ناو چوو ٠

لە دوای لە ناوچونی بنەمالەی بابان بەربوە بەری کارو باری ولاتی سولەیمانی یەکسەر کەوتە دەست کاربەدەستانی عوسمانی ولاتەکە تیك چوو ، هەر کەس بو خوی بو ، زنجیرەی کارو

باری سیاسیو ئابوریو کومەلایەتیو دارایی لە یەك ترازاو بوە گەرە لاوژە ، لە دوای لە ناوچونی بنەمالەی بابانو ئەمانی دەسەلاتی سیاسیان دەسەلاتی ئاینی ساداتی « بەرزنجە » هاتە کورەوەو دەستی پی کرد ، ئەم دەسەلاتە روژ بە روژ لە پەرەسەندنو تەشەنە کردنو گەشانەوەدا بو ئەمەشس بەهوی ئەوەوە کە تعصبی دینی لەو کاتەدا زور لە بروزا بوە ، ئەم زیاد بونی دەسەلاتەش بەهوی دوو شتی زور گرنگەوە بوە : ـ

١ ـ خوشەویستیو پیروزی خوالی خوشبو « کاك ئەحمەدی شیخ » کوری شیخ مارفی نودێی کە پیاویکی زور خاوینو دیندارو لە خوا ترس بوە ناو بانگی پاکیو دینداری بە هەمو وولاتەکانی کوردستانو ئیرانا بلاو بوتەوە • ناو بانگی زاناییو دانایی باکەی شیخ مارفی باوکی کە زور زانابوە ، بوبە پیاو چاکی کاك ئەحمەدی شیخو زانیاری شیخ مارف بونە هوی بەرز کردنەوەی بنەمالەی ساداتی « بەرزنجە » •

٢ ـ دووەم هوی دەسەلات پەیدا کردنیان ، ئاوەبو دەستیان کرد بە کرینی زەویو زارو دیهاتەکانی دەورو پشتی شاری سولەیمانی بو ئەوەی دەسەلاتی دینداریو دەسەلاتی سەرمایەو ملکداری یەك بگرن کە لەو کاتەدا دەولەمەندی لە برەوا بو ، بەم دوو هویەی باسکرا توانیان خوشەویستی خویان بچەسپینن لە دلی خەلکاو خەلك لە دەورو پشتی خویان کوبکەنەوەو لە شاری سولەیمانیو

دەوروا پشسیا نیلو دە کەنو ری‌و شـوینیکی بالاو بەریـز بو خویـان تەرخان بکـەن •

لـە ساداتی بەرزنجە یەکیکیـان تیـا هەلکەوت نـاوی « شـیخ سعید » بـو دەستی کـرد بە کرینـی ملك‌و زەوی‌و زار لـە شـاری سـولەیمانی‌و لـە چـوار دوری ، توانـلی بە بونـەی ئـەم ملك داری‌و سـەرمایەداری ـ یەوە کە لەو وەختەدا پیـاوی دەولەمەندو خاوەن ملـك نرخیکـی گـەورەی هەبـو وە ئـەویشیکی بـالای لـە نـاو کومەلەکەیـا بـو خوی تەرخـان کـرد شیخ سعید بەم جورە دەرکـەوت وە خـوی دەرخسـت‌و هەلکـەوت وە نـاوی دەرکـرد ، هـەر لـەو کاتەشـا سـولتان عبـدالحمید لە سـەر تەختی پاشـایی بـو وە خەلینەی اسـلام بـو ، شـیخ سعیدیش یەکیك بو لـە پیاوە دەولەمەندە نـاو دەرچـوەکان کـە بـە پیـاویکـی گـەورەی دەسەلاتدار نـاوی دەرکـردبو ، هـەر وەکـو لـەوە پیشـس وتمـان سـولتان عبـدالحمید لـە بـەر حراپی رەوشـت‌و خـووی ، هەمیشـە هەولی ئـەدا کە ئـەو پیـاوانەی لـە وولاتەکانی تـرا دەسـەلاتدارو دەست دارن‌و نـاویان هەیـەو قسـەیان رەوایـە لـە نـاو میللەتەکەیـانا ئەمانە لـە خـوی نـزیك بکاتـەوە ، لە بـەر ئـەوە لـە سـالی ۱۹۰۸دا عبدالحمیـد نـاردی بـە شـوین « شیخ سـعدی کوری شـیخ محمـدی کوری حاجی کاك ئەحمـەدی شـیخ »دا « ۱ » کە حـی بـو ئەسـتەموول بو دیدەنـی

---

« ۱ » تاریخـی کوردو کـوردسـتان لـە لایـەرە « ۲۲۰ » محمـد امـین زەکی بـەگ ئەلیـت « بە پـی‌ی نوسـینیکی دەسـت خەتی خوا لی خوشبـو « شیـخ مەحمودی حفیـد زادە »شـیخ معـروف نودی‌یـی کـورەزای شیـخ محمـدی

سـولتان شیـخ سـعید خـوی‌و شـیخ ئەحمەدو شـیخ مەحمـودی کوری لـە گـەل چەنـد کەسیـکی تـر لە خـزمانی خـوی چـون بو ئەستەموول عبدالحمیـد شـیخ سعیدی کـرد بـە راویـژ کەری ئاینـی تایبەتی خوی •
لـەم ماوەیەدا کـە لـە ئەسـتەموول بـون شـیخ سـعید لـە گـەل صـدری اعظـم « عـزت پاشـا عابـد »دا ریـك کـەوت کـە مامـوری تایبـەتی حکـومەت بنیرن بـو سـولەیمانی بـو زیـاد کـردنی بـاج لە سـەر بازرگـانی چونکـە لـەو سـەرو دەمەدا سولەیمانی کوری گەورەی « کـریارو فروشیـاری » بازرگانـی بـو لـە روژهەلاتـی نـزیکا دەسـت کـەوتی حکـومەت لـە بـاج سـەنـدن لە سـالی ۱۱۸۰زدا لە سولەیمانی گەیشـتە نیـو ملیـون لـیرەی ئالتـون

---

نودی‌ی‌ـە بـە « ۱۳ » پشـت ئەچیتـەوە سـەر « شـیخ عیسی »ی بەرزنجەیی کـوری سـید بابـا طاهـری همـدانی ئەلیـت بابـا طاهـر سـی کـوری بـوە « سـید نـور محمـد بەخشـس »و « شـیخ موسـی »و » شـیخ عیسـی « ئـەم دوو زاتـەی دوایـی لـە زەمانـی باوکیانـا الله همـدانـەوە هاتـون لـە دیـی بـەرزنجـە جی نشـین بـوون ، وە هەروەهـا محمـد امـین زەکـی لـەگ لـە تاریخـی سـولەیمانیدا ئەلیـت « سـاداتی بەرزنجـە » لـە نەوەی « شـیخ عیسی » کـوری بابـا علـی همـدانـین کـە ئەلـین سـید بابـا علـی بـرازای بـەناو بانـگ « بابا طاهـری همـدانی » بـوە شـیخ عیسـی لە بـەرزنجـە جی گـیر بـووە وە ـە احفـادو نـەتەوەی زور زانـای گـەورە پی گەیشـتوە وەك « شیـخ محمـدی نودی‌یی » کـە « کبـریت الاحـمر » نـاو دار بـوە وە « سید بـا رسـول‌و « سیـد محمـد محی‌الدیـن »و « سیـد محمـد سید رسـول »

## بار لە شاری سولەیمانیدا :ـ

بار لە شاری سولەیمانیدا تا ئیرە بە باشی رویشت ، هیمنو ئاسایش تا ئەهات کەم ئەبووە ، زوری پی نەچوو بار گوررا بە خراپی ، زورداریو خراپە کەوتە ناوەوە ، مەترسی بە هەمو لایەکا بلاو بووە ، دەست دریژی کردنە سەر خەلك دەستی پی کرد دوژمنایەتیو ناکوکیو دوو بەرەکی کەوتە ناو دانیشتوانی شارو شیخانەوە وە ناو شیخان خویان لە ناو خویانا ، هیمنیو ئاسایش نەما بە تایبەتی لە ناو شارەکەدا میری دەسەلاتی کز بو کاربەدەستانی میری هەموو پیاوی بی کارەو ناپاكو دەست پیس بون ، لە گەل دزو دروزنو پیاو خراپانا دەستیان تیکەل کردبو

---

ماموستا شیخ محمدی خال لە پەرتووکی « الشیخ معروف النودهی »دا ئەلیت شیخ مارفی نودییی کە ناوی سید محمدەو بە معروف بە ناو بانگە کوری سید مصطفی کوری سید احمد کوری سید محمدە کە بە کبریتی سور بە ناو بانگە بە « ١٣ » پشت ئەچیتەوە سەر سید عیسی بەرزنجەیی کە کوری سید بابا علی همدانیە بەرزنجەییەکان بە پشت ئەچنەوە سەر بابا علی همدانی کە یەکیك بوە لە زاناو ...و دارەکانی چەرخی هەشتەمی کوچی ، بابا علی همدانی سی کوری لە پاش بە جی ماوە ، سید محمد نور بەخشو شیخ موسی وە شیخ عیسی ، ئەم سی برایە لە کاتی خویا لە ئیرانەوە هاتون لە بەرزنجە ، ئەلیت ئەوە راست نیە کە بابا علی همدانی برای فیلە سوفی کورد بابا طاهری همدانی بوە ، بەرزنجەییەکان ئەچنەوە سەر بابا علی همدانی .

لە بەر ئەوە دانیشتن لە شاری سولەیمانیدا ناخوش بو ، کەس بە تەمای خوی‌و مالی خوی نەبوو ئەوانەی لە توانایانا بو سەری خویان‌و خیزانیان هەلگرت‌و کوچیان کردو وولاتەکەیان چول کرد ، هەندیکی تریشیان بەرەو ئیران کوچیان کردو زوریشی بەرەو کەرکوك رویشتن ، ئەم بی ئاسایشیە تا سەرەتای داگیر کردنی کیشا ، لەم کاتەدا شیخ سعید لە ئەستەموول گەرایەوو دەسەلاتداری شارەکەی گرتە دەست ، چەند هەولی دا ئاسایشی بو نەخرایەوە شوینەکەی خوی ، دانیشتوانی شارەکە وەرسن بون پەنایان بردە بەر هەمەوەندەکان و هایان دان بو داگیر کردنی شاری سولەیمانی‌و دور خستنەوەی پیاو خراپ لە سولەیمانی ، هەمەوەندەکان هاتن چوار روژ ئابلوقەی شاری سولەیمانیان دا لە پاشا گرتیان‌و تیا مانەوە تا هیزیکی سەربازی تورك لە کەرکوکەوە هات دەری پەراندن ، بی ئاسایشی بوە هوی بی دەرامەتی‌و بلاو بونەوەی هەژاری بە ناو چینی دەست کورتی نەتەوەدا ، ئەم بارە چەوت‌و نائەموارە بوە پەریشان کردنی زور لە دانیشتوانی شارەکەو دیهاتەکانی دەورو پشتی ، برسیەتی‌و هەژاری‌و ناچاری وای لی کردن وولاتەکەی خویان بە جی بیلن‌و کوچ بکەن بو خاکی ئیران بو توتن چاندن ، بەم جورە ئەم وولاتە جوانە رەنگینە پر لە عەشامە ویران بو وە بەرەو ویرانی ئەچوو ، لە سالی ۱۸۸۱زدا هەمەوەندەکان دیسان هیرشیان هینایەوە سەر شاری سولەیمانی‌و داگیریان کرد وە

دەسەلاتی شیخەکانیان کز کرد ، شیخ سەعید پیاویکی ئازاو وریاو نەبەزو بە تیبینی بو ، کولی نەدا ، یادی لەوە کردەوە خزمایەتی بگریت لە گەل هەمەوەندەکانا تا بتوانی رایان کیشی بە لای خویاو بیان کا بە دار دەستی خوی ، لە بەر ئەوە ئەی ژنیان لی بخوازی ، بە کردەوە کردی ، •

لە دوای بلاو کردنەوەی دەستور لە مانگی تموزی ۱۹۸دا لە هەمو وولاتەکانی عوسمانیدا ، لە کوردستانی خوارو هەراو ئاژاوە رووی دا ، هەمەوەندکان سەر لە نوی هاتن سولەیمانیان داگیر کردو دەستیان کرد بە تالان ، حکومەتی ئەستەموول کە بەم کارەساتەی زانی داوای لە شیخ سەعید کرد کە بچی بو موصل ، ئەویش لە گەل شیخ ئەحمەدو شیخ مەحمودی کوریا چون بو موصل ، لەوی لە لایەن هەندی پیاو خراپو پیاوی بازاریو نا چیزەوە بە هاندانی بازرگانەکانی موصل « شیخ سعید » و « شیخ ئەحمەد »ی کوری کوژران « شیخ مەحمود و ئەوانەی لە گەلی بون گەرانەوە بو سولەیمانی ، سویندیان خوارد کە ئەم تولەیە لە بازرگانەکانی موصل بسینن کە بونە هوی هاندانی ئەو پیاو خراپو بازاریانە کە شیخ سەعیدو کورەکەیان کوشت •

# شــەهید بــونی شــیخ ســعید ( ١ )

شیخ سعیــد له بــەر ئەوەی دەسەلاتو ســامانیکــی گــەورەی هەبــو لــە ســولەیمانیو دەورو پشــتیا ، خەلــك نرخــی گەورەیــان ئــەدایەو بە چاویکــی بــەریزو بــەرز تەماشــا دەکــرا ، لــە گــەل ئەمەشــا دوژمنــی زوربــو کــە هەمیشــە لــە بووســەدا بــون بــو ئــەوەی هەلیکیــان دەســت کــەوی دەســتیکی لــی بوەشــینن ، ئــەم هەلەشیــان لــەو کاتەدا دەســت کــەوت کــە دەســتور لــە ســالی ١٩٠٨زدا لــە ئەســتەموول اعــلان کــرا ، دوژمنەکــانی یادداشتیکــی ســکالا نامەیــان لــە دژ نــارد بــو ئەســتەموول وینەیــەکی بــو موصــل ، ئنجــا کاربەدەستانی « اتحادو تــەرەقی » فەرمانیــان دا بــە شــیخ ســعید کــە ســولەیمانی جــی بیلیو بچــی بــو شــاری موصلو دور بخــریتەوە ، شیــخ ســعید نەی ویســت ســەر کەشــی بکــا کــە زور باشــی لــەو کاتــەدا لــە تــوانایــا هەربــو بیکا . ســەری دانەوانــد بــو فــەرمانەکە خــویو شــیخ ئەحمــەدو شیخ مەحمــودی کــوری هەندیــك لــە خــزمو کەســی چــون بــو موصــل لــەوی لــە مالیکــا دانیشــتن کــە بــە ملکــایەتی هــی محــمد پــاشای صابونچــی بو لــە شــەقامی « ســەرا »دا شــیخ ســعید له موصــل مایەوە تا بەیــانی روژی جەژنــی قوربــانی ١٣٢٦ك لــە روژی دووەمــی جەژنــا شــیخ ئەحمەدو شــیخ مەحمــودو بهاالدیــن ئەفــەندی کــوری عبــداالله ئەفەنــدی خەلکــی کفــری هەرســیکیان پیکــەو ئەچــن بــو گەرەکــی « بــاب الطــوب » بــو مالــی قائمقــام مصــطفی بــەگ ناویلــەسەر

---

« ١ » الضحایا الثلاث للاستاذ عبدالمنعم الغلامی

شانشینی مالەگەوە تەماشای ئەو خەلك و عەشامەیان ئەکرد کە لە دەشتایی بەر مالەکەدا کوبوبونەوە ، پاشس ماوەیەك هەرسیدیان دینە خوارەوە بو ناو دەشتایی‌یەکە بو سەیر کردنی خەلك . لەم کاتەدا کومەلیك لە ناکەسس بەچەکانی شاری موسل خویان ئەدەن لە بهاءالدین و بە خورایی شەریان پی دەفروشن ، بهاالدین توورە ئەبیت ، ئیتر خەلکەکەی لی کو دەبنەوە پەلاماری ئەدەن دەوری شیخ ئەحمەدو شیخ مەحمودیش ئەدەن بەم جورە ئەکەونە تەنگ و چەلەمەو ، بە پەلە پرووزکی خویان دەرباز دەکەن وە ئەگەرینەوە بو مالی قائممقام و دەرگا توند لە سەر خویان دادەخەن ، لە ناو دەشتایی‌یەکەدا بو بە هەراو ئاژاوە ، ژەندرمەکان بو دامرکاندنەوەی ئەم هەرایە یەك دوو تەقەیان بە ئاسمانا تەقاند ، ئنجا خەلکەکە کەوتنە بەردە باران کردنی ژەندرمەکان ئەوانیش ناچار رایان کردە ناو قشلەکەیانەوەو دەرگایان لە سەر خویان داخست ، دەستیان کرد بە تەقە بو رەواندنەوەی هیرش هینەرەکان ئەم شەرە ئەوروژە تا ئیوارەی خایاند ، بو ئیوارە کە تاریك داهات هیرش هینەرەکان شەقامەکانیان بەر نەدا ، بو روژی دوایی سەر لە نوی شەر دەستی پی کردەوە ، ئەو روژە دە ژەندرمە کوژرا ، ئنجا عەشامە هیرش هینەرە گیرە شیوینەکان روویان کردە سەرای حکومەت ، داوایان لە زەکی پاشای والی موصل کرد کە ژەندرمەکانیان بداتە دەست ، دیارە ئەویش گویی نەدانی ، ئنجا داوای کورەکانی شیخ

سەعیدیان کرد لە گەل بهاالدین ، والی پێی وتن ، ئەوانەی ئێوە داوایان ئەکەن لای من نین لەو مالەن کە شیخ سەعیدی تیایە ، ئنجا بە جاریك هیرش هینرا بو سەر مالی شیخ سعید ئابلوقەی مالەکەیان دا ، والی کە بەمەی زانی بە کورجی فەرمانیدا بە « رشید ئەفەندی عومەری »و « شیخ ابراهیم ئەفەندی رومی » کە بچن بو لای شیخ سعید بیهینن لە گەل خویانا بو سەرا بو ئەوەی هیچی بو نەبی ، چون بو لای شیخ سعید داوایان لی کرد کە بچی بو لای والی نەك توشی زیانیك ببی ، ئەویش لە گەلیان چو ، بەلام قورئانیکی لە گەل خویا برد لە گەل نوکەریکا ، کە گەیشتنە بەر دەرگای سەرا ، دەرگاکە داخرا لە سەر فەرماندەی « تابور ئاغاسی » « ١ » کە کورد بوەو ناویانگی دەرکردبو بە « دارەکە بینە » ئەمەشی لە بەر ئەوەبو هەرچی چوتە بەر دەستی بو ترساندنی بە کوردی وتویەتی « دارەکە بینە » بو لیدانی ،هیرش هینەرەکان کە دیان دەرگای سەرا داخرا یەکیکیان بەردیکی گەورەی هەلگرتو دای بە میشکی سەری خوا لی خوشبو « شیخ سعید »ی بە سزمانا بەو پیریو ریشە سپیەوە بی تاوان شەهید کرا ، نوکەرەکەشیان کوشت ئنجا هیرشیان بردە سەر مالی شیخ سەعید بو کوشتنی کورەکانی بەلام لە پیش ئەوەدا بگەن « شیخ ئەحمەدو شیخ مەحمود »

---

« ١ » « اضحايا الثلاث »ی عبدالمنعم الفلامی ئەلیت « تابور ئاغاسی » ناوی توفیق بوەو خەلکی شاری سولەیمانی بوە .

چونــه مالــی دراوسی‌یه‌کیــان کــه هه‌مه‌وه‌نــد بــو نــاوی « محمــود خــدر » بــو له‌ویشــه‌وه ده‌ربــاز بــون چونــه مالــی صابونچــی لــه‌ویوه ناردیــان بــو ســه‌رای حکــومه‌ت لــه ریگــا « شــیخ ئه‌حمــه‌د »یشی کــوژرا ، شــیخ سعیدی خــوا لــی خوشبــو بــی گونــاه ، بــی تــاوان خوشــی‌و کوریشــی بــه ته‌رن شــهید کــران کــه ئه‌مــه بــوه له‌که‌یه‌کی گــه‌وره بــو دانیشتــوانی شــاری موصــل لــه داوی شــه‌هید بو‌ــــی شیــخ ســه‌عیدو شیخ ئه‌حمــه‌د ، شیخ مه‌حمــودی به‌رزنجــه‌یــی کــوری بــوه جــی نشینــــی ، شیــخ مه‌حمــــود لــه‌و بــاوه‌ره‌دا بــو ، کــه بازرگانه‌کانــی ســوله‌یمانی ده‌ستیان ، بــوه لــه کوشــتنی باوکــی‌و کاکیا لــه بــه‌ر ئه‌وه نیــازی وابــو ته‌نــگ به بازرگانــه‌کان هه‌لچنی ، بــه‌م جوره لــه وولاته‌که‌دا هــه‌راو ئــاژاوه پــه‌یــدا بــووه ، ئاســایشــ‌و هیمنــی نه‌ما ، بازرگانــه‌کان ســکالایان بــرده بــه‌ر حکومه‌ت والــی موصــل هات بو ســوله‌یمانی نوینــه‌رانی هه‌ردو لا به جیــا چــون به پــیریه‌وه ، نوینه‌ری بازرگانــه‌کان‌و نوینــه‌ری شیــخان ، والی لایه‌نگــری شیخــانی کرد ، لــه دوای هاتنــی بــو ســوله‌یمانی به « ٢٤ » ســه‌عات نوینه‌رانی بازرگانــه‌کانی بانــگ کــرد بــه زبانی تورکی بــه شیوه‌یه‌کی توندو تیژو پر له توره‌ییه‌وه لــه گه‌لیــان دوا ،داوای لی کــردن بوچی بازرگانه‌کان رقیان لــه شیخــانه ، بازرگانه‌کان وه‌لامیان نه‌دایه‌وه‌و له لــی پرسینه‌وه که‌شا به‌شــدار نه‌بــون ، والــی ئــه‌م به‌شــدار نه‌بونه‌ی کــرد به به‌لگه به ده‌ســتیه‌وه بو تاوان بــار کــردنیان ، به حکومه‌ته‌که‌شــی راگه‌یانــد که بازرگانه‌کان تاوان بارن ، لــه ســه‌ر ئه‌مــه حاکمیکی تــازه بــه هیزیکی گه‌وره‌وه نــیررا بو سلیمانی ئه‌و

هیزه دابەش کرا بە سەر « پیجوین »و « بیستان »و ( گول عەنبەر )و ( هەلەبجە )دا وە نزیکەی « ١٥٠ » سەربازی خویریو دەمړووتی چەرداوەروی چەقاوە سوو لە گەل حاکما لە سولەیمانی مانەوە ، بار تا ئەهات رور بە روژ خراپتر ئەبو ، ئنجا شیخەکان لەم بارە وەرس بون داوای یارمەتیان لە هەمەوەندەکان کرد ،ئەوانیش هاتن سولەیمانیان تالان کردو مەترسیەکی زوریان بلاو کردەوە بە شارەکەدا کومەلی « اتحادو تەرەقی » لە ئەستەموول بەمەیان زانی ئەوانیش بە گورجی کەوتنە خویان والیەکیان نارد بو موصل وە متصرفیك بو سولەیمانی ، شیخەکان ئەمەیان زور لا ناخوش بو دیسان هاتن هەمەوەندەکانیان هاندا بەلام ئەمجارە لە دژ حکومەت ، ئەم هەراو ئاژاوەو بگرەو بەردەیە تا شەری گەورەی جهانی یەکەمی خایاند ، ئەوەبو لە ئەنجامی ئەو شەرە گەورەیەدا تورکەکان ژیر کەوتنو عیراقو کوردستانی خوارو کەوتە ژیر دەسەلاتی بەریتانیاوە

## وەستانی شەری گەورە لە بەینی تورکیاو سویندخوارانداو وە بار لە کوردستانی خوارودا

لە روژی ۳۰ی تشرینی یەکەمی ۱۹۱۸زدا وەستانی شەر «موتارەکە» لە بەینی دەولەتی عوسمانیو سویند خوارانا بلاو کرایەوە ، « علی احسان پاشا »ی سەرکردەی سوپای عوسمانی لە موصل بو لەویوە تەلگرافیکی لیدا بو « شیخ مەحمود » بە ناوی حکومەتی عوسمانیەوە کە پاشەروکی سوپاکەی لە درای بەزینو راکردن هیشتا لە موصلا مابو ، داوای لە شیخ مەحمود کردبو کە حکمرانی وولاتەکەی سولەیمانی بکا ، ئەوەی پیویستی بیت لە ئازووقەو تفاقی جەنگیو چەكو تەقەمەنی بیداتی ، نزیکەی « ٥ » هەزار لیرەیەکی ئالتونیشی بو ناردبو ، بەلام شیخ مەحمودو کوردەکان ئەوەندەیان خراپەو ستەم لە تورکەکان دیبو زور لیان داخ لە دل بون ، لە بەر ئەوە شیخ گویی نەدایە ئەم تەلگرافەو نرخی نەدابە ، بە پیچەوانەی ئەوە کە هاتەوە بو شاری سولەیمانی « تابور »یك سەربازی تورك گیریان خواردبو ریگایان نەبو دەرباز بن ، چونکە ریگای کەرکوکیان لی برابوە بەست شیخ خوی ئەم « تابور »ە سەربازەی گەیاندە کەرکوك داینە دەست ئینگلیزەکان لە دوای دوانو ریکەوتن لە گەل ئینگلیزەکان گەرایەوە بو سولەیمانی ، لە ناوەراستی مانگی تشرینی دووەمی ۱۹۱۸دا « مبجر نوئیل » بە مەفرەزەیەکەوە گەیشتە سولەیمانی ، پیشوازیەکی

گەرمو باشی کرا ، تەماشای کرد وولاتەکە ویرانە ، نا تەوە پەریشانە ، تورکەکان خوینیان مژیونو خستویاننە سوال ، شارەکە هەموی بوە بە کەلاوەو روخاوە بازرگانیو ئیشو کار وەستاوە دەست بە جی کاربەدەستانی میری دانا بە پیی ئارەزووی دانیشتوانی وولاتەکەو رەزامەندیان ، سیاسەتی ئەو کاتەی ئینگلیز وابو کە لە سولەیمانیدا سەربەخویی واتە « خود مختاریەك » بدا بە کوردەکان ، بویە شیخ مەحمودی کرد بە حکمرانی ناوچەکە ، چونکە لەو دەمەدا لە شیخ مەحمود پیاو ترو هەلکەوتو ترو بە دەسەلات تر نەبو لە ناوچەکەدا ، لە بەر ئەوە ئینگلیزەکان بریاریان دا یارمەتی بدەن وە بیکەن بە حکمران وە بە کردەوەش کردیان ، لە هەمو ناوچەکانی ترشا کاربەدەستان دانران کە کارو باری وولاتەکە بە باشی بەرن بە ریوە ، سەروکی خیلەکان هەمو کران بە سەروکی تەواو بو بەریوە بردنی هەمو جورە کارو باریکی خیلەکانیان وە ئەم سەروکانە هەمو وەك کاربەدەستیکی میری وابون لای میری •

« میجر نوئیل » لە سەر داوا کردنی « ویلسون » وەکیلی حاکمی گشتی بەریتانیا لە عیراق لە تشرینی دووەمی ١٩١٨زدا کوبونەوەیەکی گشتی فراوانی لە شاری سولەیمانیدا کرد هەمو پیاوە دەسەلاندارو پیاو ماقولانی ناو شارو سەروك خیلەکان بەشدار بون لەم کوبونەوەیەدا ، بەرای گشتی « شیخ مەحمود »یان کرد بە « حکمداری کوردستان » ئەوی پیویست بو ئەم حکمرانیە هەموی

پیك هات ، سەروك خیلەكانی كوردی ئیرانیش لەم كوبونەوەیەدا بەشدار بون ، « میجر نوئیل » بو بە راویژ كەری سیاسی وە « میجر دانلیس » بو بە راویژ كەری سەربازی حكومەتی كوردستان ، ئینگلیزەكان لە سەرەتادا زور یارمەتی شیخ مەحمودیان داو دلسوزانە ریی راستیان پیشاندا بو ئەوەی حكومەتەكەی بە بلشی لە سەر بناغەیەكی پتەوو بە هیز دابمەزرینریت كە لە پاشە روژا تووشی هەر لەرزینو تەنگو چەلەمەیەك هات هەرەز نەهینیو نەرووخی ، هەروەها لە وەزارەتی مستعمراتی بەریتانیاوە لە لەندن لە روژی ١٠ی مایسی ١٩١٩دا بروسكەیەك هات بو حاكمی گشتی بەریتانیا لە عیراق لە بەغداد مستر « ویلسن »

ئەلیت : ــ « ئەبی وولایەتی موصلی عەرەبی دروست بكریت وە لە تەنیشتیەوە ولایەتیكی كوردی مستقل ئیستقلالی داخلی لە ژیر ئیدارەی بەریتانیادا دروست بكریت كە سەروكەكانیان لە خویان بیتو راویژ كەریان ئینگلیز بن » واتە بە پیی ئەم بروسكەیە ئینگلیزەكان لەو دەمەدا ویستویانە سەربەخوییەك بدەن بە كوردەكان ، بەم جورە شاری سولەیمانی بو بە پایتەختی حكومەتی كوردستان ، هەمو كوردی جهان بەم مژدە خوشە دلشادو شادمان بونو سولەیمانی بو بە لانكەی سیاسی كوردستان ؛ كوردی ئیرانو سوریەو توركیە هەمو چاویان بریە سولەیمانی •

مەبەستی بەرو دوای ئینگلیز لە دامەزراندنی ئەم حکمرانیەو ئەم پارەمەتی دانەی شیخ مەحمود ئەوەبو کە مەیلی بیرن لە تورکیا ، چونکە پاشماوەی لەشکری پەراگەندەی تورك هیشتا لە « رەواندوز »و « پەسوی » کلکیان توزی دەکرد ، وە ئینگلیزەکان باشی لەوە گەیشتبون کە ، وولاتی سولەیمانی بە هیچ جوریك لە تورکەکان دانابرن بەوە نەبی کە حکمرانیەكو سەربەخوییەکیان بدریتی لە ژیر چاودیری ئینگلیزا ، جا لە بەر ئەوەو لە بەر خاتری چاکەو دەست کەوتی خویان بریاری دروست کردنی ئەو خود ــ مختاریەیاندا •

لە یەکی کانونی یەکەمی ١٩١٨زدا وەکیلی حاکمی گشتی بەریتانیا لە عیراق « کولونیل ویلسن » هات بو دیدەنی شاری سولەیمانی ، کوبونەوەیەکی فراوانی کرد لەم کوبونەوەیەدا زیاد لە « ٦٠ » سەروکی گەورە بەشدار بون ، ئەمانە هەندیکیان لە ئیرانەوە لە « سنەو »و « سەقز »و « هەورامان » ەوە هاتبون ، ویلسن چەند جاریك لە گەل شیخ مەحمودا دوا باسی باری سیاسی وولاتەکەی بو کردن دەرکەوت کە کوردەکان بە هیچ جوریك تورکیان نەدەویست وە بە توندیو ئارەزووەوە حەزیان بە بەریوەبەری بەریتانیا دەکرد وە ئەیان ویست یەکسەر بەریوەبەرایەتی ولاتەکەیان بە دەست بەریتانیاوە بیت ، هەندیکیشیان دەیانویست کوردستان لە عیراق

جیا بکریتەوەو یەکسەر بەریوەبەرایەتی بەستریت بە « لەندەنەوە »
چونکە وایان دەزانی کە « لەندەن » « ئەستەمول »ی جارانە
لە دوای گفتو گویەکی زورو بینەو بەرەو دەمەتەقی بە ناوی
هەموانەوە ئەم یادداشتە نوسرا : ــ
« حکومەتی خاوەن شکوی بەریتانیا مەبەستی لەم جەنگەی
جهانی سەربەخویی و ئازادی نەتەوەکانی روژهەلات بوە لە دەست
زورداری و ستەمی تورك ، وە یارمەتی دانیان بو سەندنی ئازادی و
سەربەستی » •

سەروکەکانی کوردستان داوا لە حکومەتی خاوەن شکوی
بەریتانیا ئەکەن کە قبولیان بکا لە ژیر دەسەلاتی خویا بن
وە بیان بەستی بە عیراقەوە بو ئەوەی بی بەش نەبن لە
دەستکەوتی ئەم پەیوەندیە ، وە داوا لە حاکمی گشتی بەریتانیا
ئەکەن کە نوینەریکی خوی بنیری لەگەل یارمەتی پیویستا
کە ببیتە هوی پیشکەوتن و بلاو بونەوەی ئاسایش و ژیانیکی
پر لە ئاشتی لە چوار چیوەی مەدەنیەتدا لە ژیر چاودیری
بەریتانیادا ، وە هەمو بەلین ئەدەین ئەگەر حکومەتی خاوەن شکوی
بەریتانیا دەستی یاریدەو یارمەتی بو دریژ کردن ، بو هەموو
داوا کردنەکانی خاوەن شکو وە ئاموژگاریەکانی گوی رایەل بن

بەرامبەر بەم یادداشتەی پیاوە گەورەکانی کورد حاکمی گشتی

شاهانەی بەریتانیا « ویلسن » یادداشتێکی مور برد ئەڵیت : ـ
« هەرچی خێلێك لەو خێلە کوردانەی کە جی نشینن لەو ولاتانەدا کە لە زێی گەورەو تا « دیالی » دەست پی ئەکا « جگەلە ناوچەکانی ئێران » بە ئارەزوی خۆیان حەز بکەن بە « پێشەوایی » شیخ مەحمود وە فەرمان رەوایی ، ئەتوانن ، وە ئەو وەختە ئیمەش لایەنگری معنوی شیخ مەحمود ئەکەین لەو ناوچانەدا کە لە سەرەوە باسکرا کە حکمرانی هەموی بکا بە ناوی حکومەتی بەریتانیاوە « ۱ » •

خێلەکانی دەوری کەرکوكو کفری‌و خانەقین حەزیان لە حکمرانی شیخ مەحمود نەدەکرد ، شیخ خوشی ئەمەی دەزانی‌و وازی لەم داوا کردنە هینابو ، بەم جورە ناوچەی کەرکوك جیا کرایەوە وە هەر وەها ویلسن بە سەرەك خێلەکانی ئێرانی ووت : ـ
« لە بەر ئەوەی یەکیەتی هەیە لە نیوەند ئێرانو بەریتانیادا ئیمە ناتوانین لە ئێراندا هیچ بکەین وە داوای لی کردن کە هەموو بگەرینەوە بو شوینەکانی خویان » •

---

« ۱ » بەکار هینانی ووشەی « بە ناوی حکومەتی بەریتانیاوە » لە لایەن مسوولیکی بەریتانیاوە ئەوە دەردەخا کە بەریتانیا دانی نەناوە بە حکمرانیەکەی کوردا .

نوسەر

لە دوای ئەم کوبونەوەیە زور لە خیلەکان هاتنە ئەم یەکیەتیەوە ، لە روژی ١ کانونی یەکەمی ١٩١٩زدا « میجەر نویل » چو بو « رەواندز » تەماشای کرد دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بە گەرمیو بە ئاشکرا حەز بە حکمرانی شیخ مەحمود ئەکەن وە بە دل ئارەزوی ئەکەن ٠

نەتەوەی کورد لەم کاتەدا زوربرسیو بی دەرەتانو پەریشان بو ، زور تینوی هیمنیو ئاسایش بو ، بویە زور بە گەرمی هاتن بە پیر ئەم یەکیەتیەوە وە یادداشتە میژوییەکەیان بە شانازیەوە مور کرد ٠

## *شیخ مەحمود کییە ؟ :ـ

شیخ مەحمود کوری شیخ سعیدە وەك لەوە پیش باسکرا ، پیاویکی هەلکەوتو ئازاو چالاكو دلیرو داوین پاكو رەوشتو خوو جوانو قارەمانو دلسوزو نیشتمان پەروەر بو ، زور دل نەرمو راستو لە خوا ترس بو چاوی لە چاکەی هەمو کەس بو بە تایبەتی چاکەی ولاتەکەیو نەتەوەکەی ، بەلام زور خوش باور بو سیاسی نەبو ، لە سیاسەتا کول بو وە لە

کارو باری سیاسی‌دا قال نەبوبو ، چونکە لە ماوەی ژیانیا لە کارو باری سیاسی‌دا ئیشی نەکردبو تا بتوانی لە دەریای بی بن‌و گەورەو قوولی سیاسەت‌و دپلوماسیەتا مەلە بکاو بپەڕێتەوە ، هەر وەها شیخ مەحمود راویژ کەرو رابەری سیاسی‌و داناو بە توانای لە دەور نەبو کە رابەری بکەن‌و ریو شوینی سیاسی‌و نەخشەی سیاسی بو بکیشن‌و بیخەنە سەر ریی راست ، وە بەختی رەشی کوردو بەختی خوشی نەیهینا کە وەك پیشەوایەکی گەورەو نیشتمان پەروەر ئەم حکمرانیە بەریتە سەرو ولاتەکەی رزگار بکاو ئازادی بکا وەك نەتەوەکانی تری جهان ، بەد بەختی گەورەش لەوەدابو کە لەو کات‌و دەمەدا سێ تەیاری سیاسی معاکس ئابلووقەی ئەم حکومەتە ساواو ئەم حکمرانە دلسوزە نیشتمان پەروەرەیان دابو دەمیان تی ژەندبو وە خویان سەپاندبو بە سەریاو خویان کردبو بە رابەری سیاسی‌و راویژ کەری ئەم حکومەتە ساوا لە غەم نەرەخسیوە ، هەر تەیارە بیرو باوریکی سیاسی تایبەتی خوی هەبو ، کە بە توندی ئەیویست بیچەسپینی وە هەولی ئەدا سەرنجی شیخ مەحمود بە لای خویا وەرگیری چی ئەو ئەیەوی‌و بوی دەست ئەدا شیخ مەحمود ئەوە بکا ، جا خراپتر لە هەمو شتیك ئەوەبو کە ئەمانە هەمو نزیك بون لە شیخ مەحمودەوەو پەیوەندی دوستایەتی‌و خزمایەتی هەبو لە بەینیاندا لە پیشس حکمرانیەکەیا ، تەیارەکانیش ئەمانە بون : —

١ ــ بەرەی خزم و کەسانی شیخ مەحمود کە « بەرزنجەییەکان »
بون ئەمانە چونکە خزمی شیخ بون وە لە شیوەیەکی
خیلەکایەتیدا ژیابون ، بویە بی سلەمینەوە لەوە پیش چۆن وە چیان
کردبو لە گەل شیخ مەحمودا ئەمجارەش بی سلەمینەوە
وایان دەکرد ، کەس نەبو دەست بەرێتە بەریان وە هیچ کار
بەوەش دەیان نازیو پشتیان قایم بو کە دەسەلاتداری بە
دەست شیخانەوەیە ، بویە ئەمانە وەك جاری جاران دەرویشتن
بە ریوەو شەوولیان لی هەلکیشابو ، لاشیان وابو مادام
شیخ مەحمود حکمرانەو حاکمی ولاتەکەیە ئیتر ئەوان هەرچی
بکەن کەس نابی دەست بینتە بەریانو لییان بپرسیتەوەو
هەمو شت بە دەست خویانەو خویان حساب بن ، شیخ مەحمودیش
لە توانایا نەبو ئەم کردەوانە بەمانە تەرك بکاو رادەیەکیان بو
دابنی ، نەی ئەویست دلیان بردنجینیو لە خویان بکا بویە
ئەم تەیارە بو بەرهەست نەدەکرا ، لە بەر ئەوە ئەمانە
کەوتنە خراپە کردنو دەست دریژی کردنە سەر خەلك ، وە
بونە درکو ئالان لە دامینی ئەم حکومەتە ساوایەو ئەم حکمرانە
دلسوزەوە ، وە هەمیشە گویچکەی شیخ مەحمودیان پر ئەکرد
لە دژ رژیمی حوکمو بونی ئینگلیزو لە دژ خەلکی تر ، وا چوبوە
میشکیانەوە کە مادام شیخ مەحمود بو بە حکمرانی کوردستان
وە تورکیش نەما ئیتر هەمو شت براوەتەوەو تەواو بوە وە
دونیایان بو تەخت بوە پیویست ناکا ئینگلیزی کافر لە

سولەیمانیدا وە لە کوردستاندا بمینن ، ئەمان خویان هەمو کارو باریکی حکومەتی کوردستان ئەبەن بە ریوە ، ئیترعەوەجی ناکا بە بونی راویژ کەری سیاسیو راویژ کەری سەربازی ئینگلیز ، بەد بەختی کوردو حکومەتی ساوای کورد لەوەدابو کە هەر یەکیك لەوانە خویان بە دیپلوماسیو راویژ کەریکی سیاسی دەزانی لە بەر ئەوە ئەمانە یەکەم هو بون بو تیکدانو گورینی بیرو باوری شیخ مەحمود وە ئەوان بە زوری کاریان لە دەمارو بیرو باوری ئەکرد بە ناوی ئایینو اسلامەوە لە ریی راست لایاندا ٠

٢ ــ تەیاری دووەم : ــ بەرەی تورك خوازەکان بون یعنی « تورکیزمەکان » کە لەو وەختەدا ناتورەیەکی تازەیان لەم بەرەیە نابو پییان دەوتن « جل خوار » ئەمانە سەر بە حکومەتی تورك بون وە زوریان لەو کاربەدەستانە بون کە لە لای تورکەکان بونو ئیستا بی ئیشی ماونەوەو تەقاویت بون ، ئەمانەش زور لە شیخ مەحمودەوە نزیك بون بەهوی ناسیاوی کونیانەوە ، سەروکی ئەم بەرەی جل خوارە « تایەری ئەمین ئەفەندی » بو کە لە باسی ئوزدەمیردا بە دورو دریژی لیی ئەدویین ، ئەم جل خوارانە بە توندی هەولیان ئەدا شیخ مەحمودیان هان ئەدا لە دژ ئینگلیزەکان ، ئەمانە بە ناوی اسلامیەتەوە شیخ مەحمودیان هان ئەداو دەماریان ئەجولاند

٩

کە ئینگلیزەکان کافرن‌و پارەیان حەرامە ، ئەویشس پیاویکی دلسوزو دل ساف بو باوری پی دەکردن ، وە دلیشی لە ئینگلیزەکان رەنجابو ئەمانە بە شیخیان ئەووت لە گەل تورکا ریك بکەویت باشە با ئەم کافرانە لە وولاتەکە دەرکەین ، ئیمە چیمان داوە لەم کافرانە وە ئەم کافرستانیە بوچی •

علی احسان پاشا هیشتا لە موصل بو « ئوزدەمیریش » لە دەورو پشتی « رەواندز » بە خوی‌و چەند سەربازیکی شرو رووتەی توزکەوە لەو ناوەدا دەگەراو پرو پاگەندەی پر لە دروو دەلەسەی بلاو دەکردەوە بەو نیازەی سەر لە سیاسەتی ئینگلیز بشیوینی‌و لە عیراقداو خەریکیان بکا لە کوردستانا ، وە بە توندی هەولی ئەدا خوی بگەیەنیتە شیخ مەحمود •

۳ ــ تەیاری روشن بیران‌و ئەفسەرە کوردەکان بو کە لە گەل شیخ مەحمود بون بمە دل‌و بە گیان ، هەمو دنیا دیدەو خاوەن تجربە بون ، وە هەمو لە تورکیادا ئەفسەری گەورە گەورەو سەر کردەی لەشکر بون وە شارەزاییان هەبو لە سیاسەتی ئەو روژەی دەولەتانا ، ئەو روشن بیرانەش ئەمانە بون : ــ

۱ ــ مصطفی پاشا یاملکی •

۲ ــ صالح زەکی صاحبقران •

۳ ــ عزیز حکمت قزاز •

٤ ــ محمود جودت •

٥ ـ رشيد جودت •
٦ ـ رشيد زكي كابان •
٧ ـ توفيق وهبي •
٨ ـ صديق پاشا قادری •
٩ ـ ئەمین رەواندزي •
١٠ ـ قالەی ئایشە خان •
١١ ـ كامل حسن ئەفەندی •
١٢ ـ جمال عرفان •
١٣ ـ عارف صائب •
١٤ ـ عزت توپچی •
١٥ ـ ماجد مصطفی •

ئەم روشن بیرانە هەمو لە توركیاوە گەرابونەوە لە حكمرانی شیخ مەحمودا بەشدار بون ، هەمو دلسوزانە ئاموژگاری شیخ مەحمودیان دەكرد دەیان ووت « ئیمە لە دەست زورداریو خراپی تورك رزگار بوین ، بەهوی هاتنی ئینگلیزەوە ، ئەبی ئیمە تا خومان دەگرینو دەولەتەكەمان بە هیز دەكەینو لە غەم دەیرەخسینین لە گەل ئینگلیزا شان بە شان بروین ، بەریوە تا بە تەواوی سەربەستو ئازاد ئەبین وە سیاسەتی ئەمرو چونەو چون ئیجا بئەكا ئەبی لە سەر ئەو سیاسەتە بروین بە ریوە وە ئەبی ئیمە واقعی بین ، لە بەر ئەوە لەم بابەتەوە هەولو تەقەلایەكی زوریاندا لە گەل شیخ مەحمود ،

بەلام بەرەی جل خوارو خزمەکانی شیخ ، کە بە توندی لە دژ روشن بیرەکانو ئەفسەرەکان بون وە بە ناوی ئاینو اسلامیەتەوە ئەمانەیان لای شیخ لەکە دار کردبو وە دلی شیخیان لەمانە کرمی کردبو ، وایان لە شیخ گەیاندبو ئەمانە کافرنو کفر دەکەنو عەرەق دەخونەوە ، ناویان نابون « فەرمەسون » مانای بی دین ، جا بویە شیخ هەرگیز قسەی ئەمانی نەدەچو بە گویداو گویی نەئەدایە ئاموژگاریان ، وە هەمیشە بە چاوی نزم تەماشای دەکردن .

ئەم سێ تەیارە سیاسیە بە توند یلە کوردستانا بە تایبەتی لە شاری سولەیمانیدا خەریکی ئیشس کردن بون ، شیخ مەحمود چونکە لەوە پیشس حکمرانی نەکردبو وە راویژ کەری سیاسی دلسوزی نەبو کەوتبوە ناو شەپولی توندی دەریای سیاسەتەوە ، خوشی پیاویکی دلسوز بو نەگوزرا بو ، زور خوشس باوریشس بو ، هەرچی بیویستایە دیدەنی بکا گەورەو بچوك بی ئزن خواستنو دانانی کاتی دیدەنی لیپرسینەوە بەکسەروەچون بولای بو دیدەنی وە چیان بویستایە پییان ئەووت وەمەبەستیان چی بوایە پییان جیبەجی دەکرد چونکە زور جاریشس لە روا لەتا دادەما ئەو شتەی کە نەدەکراو نەدەبو بکریت ناچار ئەیکرد ، وە ئەوانەی وا بی پەروا ئەچون بو لای شیخ مەحمود هەر یەکە خوی بە وەزیریك یان بە سەفیریك یان سیاسیەکی گەورە دادەنا دەچو بیرو باورو رای خوی بەرامبەر بە زور کارو باری گرنگی وولاتەکە دەر دەبری

ئەی ووت قوربان بە قسەی فەرمەسونەکان مەکە وەك من عەرزت ئەکەم وا بکە •

لەم سێ بەرە سیاسیە لە هەموان لە پێشترو زیاتر بەرەی « جل خوار »ەکان « تورکیزمەکان » بون ئەمانە زور لە شیخەوە نزیك بون لە گەل خزم و کەس و کارەکەی خویا کە بە تەواوی بە سەر بیرو باوری شیخا زال بوبون وە کاریان لی کردبو وە لە خشتەیان بردبو ، ئەم دوو بەرەیە بو هاندانی شیخ لە دژ ئینگلیز یەکیان گرت بە هەردوو لایان بە ناوی ئایین و اسلامیەتەوە شیخیان لە ری راست لاداو هایان داو وایان لی کرد کەوتە لە دژ بونی ئینگلیز ، هەرچی راویژ کەرە ئینگلیزەکان بیان وتایە چاك و خراپ شیخ پیچەوانەی داوا کردنی ئەوان ئەجولایەوەو ئیشەکەی ئەکرد •

وە هەمیشە لە دژیان بو ، بەم جورە شیخ ویستی دەستی حکومەتی بەریتانیا لە کوردستانا نەهیلیت ، ئینگلیزەکان کە ئەم کردەوانەیان لە شیخ مەحمود دی زانیان کە شیخ مەحمود هاندراوەو نیازی خراپەی هەیەو ئەیەویت دەریان پەرینیت و دەستی تورکەکان بخاتەوە ناو کارو باری ولاتەکەوە وەکو جاران ، ئەم بی مەیلی و کردەوانەی شیخ بوە هوی ساردی لە بەینی حکومەتی کوردستان و ئینگلیزا وە پشت ساردبونەوەی لە دروست کردنی حکومەتی کوردستان ئەگەر لە نیازیا بوبی بە راستی دروستی بکا کە هەرچەندە من بی گومانم لەوەی

کە حکومەتی ئینگلیز لە دلیا نەبوە ئەو حکومەتە بو کورد دروست بکاو بە روالەت کردویەتی بەلام ئەبوایە سیاسەت لەو کاتەدا بەو جورە نەبرایە ریوە لەم کاتەدا هەمو سەروك خیلەکانی دەورو پشتی سولەیمانیو کوردەکانی ئیران یادداشتیکیان مور کرد کە هەمو شیخ مەحمودیان قبولە بە حکمرانی کوردستان ، بەلام ئینگلیزەکانیش باوریان بە شیخ نەمابو وە دلیان لیی کرمی کردبو ، وە زور باشیش ئەوەیان دەزانی کە ئەمرو شیخ مەحمود یەکەم پیاوی کوردە لە ناوچەی سولەیمانیدا وە کەس نیە شان لە شانی بدات ، وە ئەوەشیان باش زانی بو کە ئەم پیاوەیان پی رام ناکریتو لەوانە نیە بتوانن بیهیننە سەر ریو سەری پیدا بنەوینن و کارو باری خویانی پی بەرن بە ریوە ، لە بەر ئەوە دەستیان لی شت وە خویان کیشایە دواوە لە گەل ئەوەشا کە باش لەوە گەیشتبون کە شیخ زور کوردیکی راستو نیشتمان پەروەرە بەلام دەورو پشتی خراپن ، ئینگلیزەکان کەوتنە پرو پاگاندە بلاو کردنەوە لە دژ شیخ مەحمودو حکومەتی کوردستان وە بە تەواوی بریاریان دا کە ناوی حکومەتی کوردستان لە میشکیانا بسرنەوە ، وە ئەو نیازەی بویانە « کە هەرچەند راست نەبوە » لە بابەت دروست کردنی حکمرانیەك بو کوردستان وازی لی بینن و لە بیر خویانی بەرنەوە ، بەم جورە شیخ مەحمود لە دوستیکی باوەر پی کراوەوە بوە دوژمنیکی ئینگلیز ، هەر وەها ئەم دوو هیزە لە

یەکتـر ئاشکـرا بـون ئنجـا شـیخ مەحمـود دەسـتی کـرد بـە هاندانی خیلەکانـی دەرەوە لـە دژ ئینگلیـز ، سـوارەی نـارد بـو لای « محمـود خانـی دزلـی » کـە بـە لەشکـرەوە بیت بـو سـەر سـولەیمانـی ئەویشـی بـە لەشکـریکی گـەورەوە هـات بـو سـەر سـولەیمانـی ، شـیخ مەحمـود بـە تـەواوی پـەردەی در یلـە روژی ٢٥ مایس ١٩١٩دا هەمـو ئینگلیـزەکـان کـە لـە سـولەیمانـی بـون گـرتنیو خستنیە بەندیخـانەوە وە شـورشی بەرامبـەر ئینگلیـزبـەرپا کرد لـە سولەیمانیدا دەنگـی هەورامیـەکانـی دا کـە هەلسـنو هەلەبجـە داگـیر بکـەن ، ئەوانیشـی هەلەبجـەیان داگـیر کـرد ، ئینگلیـزەکان بـەم ئیشـەی شیخ مەحمـود زور شـلەژان وە بـە تـەواوی دلیـان لـیی رەشـی بـوو بـریاریـان دا نەخشـەی سـیاسەتیـان بـەرامبـەر کوردسـتان بگـورن لـە بـەر ئـەوە لـە روژی ٢٢ ئـابـی ١٩١٩دا بـروسـکەیـەك لـە وەزارەتـی مسـتعمراتی بەریتانیـاوە لـە لەنـدەن بـە پەلـە نیـررا بـو حاکمـی گشـتی بـەریتانیـا لـە بەغـداد کـە « ویلسن » بـو ئەلیت :ـ « حکـومەتی بەریـتانیا بـە پـیی زروفـی تـازەی ئـەو ولاتـەوە هیـچ جـورە ئوبالیـك ناخاتـە ئەسـتوی خـوی لـەود بەولاوە کە سەربەستیو ئاسـایشـو بـەریـوە بـەریەك کـەوا پـیویستە بکـریت لـە ناوچەی کوردسـتانا ، وە حکـومەتی بەریتـانیـا بـە هیـچ جـوریك بـەریـوە بـەری یەکسـەری کـوردسـتان ناگـریتە ئەسـتوی خـوی ، ئەگـەر لە پیشـا ئـەو بـاوەرەی بوبـی « یعنـی ئینگلیـز » لـە بـەر ئـەوە ئیمە لـە بـروسـکەی روژی ١٠ مابسـی وا بـریارمـان دا کـە حکومەتیکی

سەربەخوی « زاتی » لە ژیر چاو دیری خومانا دروست بکەین لە کوردستانا بەلام وا دیارە ئیستا ئیمە خراپ تیگەیشتوین لە دوای ئەم شورشی کوردە ، لە بەر ئەوە پاشە روژی کورد ئەدەینە دەست خویانو ئیمە واز دەهینین » •

ئینگلیزەکان کە ئەو کارەساتەیان لە شیخ دی ئنجا کەوتنە خویانو سوپایەکی گەورەیان لە کەرکوکەوە نارد بو سەر شاری سولەیمانی بو لە ناو بردنی حکمرانی شیخ مەحمودو لە ناو بردنی حکومەتی ساوای خیر لە خو نەدیوی کوردستان شیخ کە ئەمەی بیست ئەویش کەوتە خوی لەشکریکی گەورەیان ناردبو بەرەنگاری کردنی هیرشی سوپای گەورەی بەریتانیا •

## هاتنی سون بو سولەیمانی : ـ

لە ناوەراستی مانگی مارتی ١٩١٩دا « میجر ئی • بی سون » کرا بە حاکمی سیاسی سولەیمانی ، میجر سون زور شارەزایی هەبو لە کوردستانی خوارودا ، سون بو ئەوە نیررا بو سولەیمانی کە تەنگ بە شیخ مەحمود هەلچنی ، چونکە سون لە دژ کردەوەکانی شیخو شیخان بو ، سون ماوەیەکی زور لە ناوچەکانی عیراقو ئیراندا بە جاسوسی سوراوەتەوە هاتنی بو سولەیمانی بە تایبەتی بو کەم کردنەوەی دەسەلاتی شیخ بو ، سون لە پیش ئەوەدا بیت بو سولەیمانی چو سەریکی دا لە ناوچەی کەرکوكو کفری وە عەشایەری ئەو دوو شوینەی ئامادە کرد بو لە دژ بونی شیخ مەحمودو لایەنگری خوی ، لە سەر ئەوە پیلانو نەخشەی سیاسەتی خوی کیشا کە پیرەوی بکا ، سون بە هەموو جوریك هەولی ئەدا کە دەسەلاتداری شیخ مەحمود کز بکاو خەلکی لی دوور بخاتەوە ، لە بەر ئەوە لە سولەیمانیەوە راپوریکی « ١ » ناردوە بو بەغداد لە دژ شیخ مەحمود ئەلیت : ـ « دەسەلاتی شیخ مەحمود بە توندی لە کز بونایە لادییەکان ئەمەیان زور پی خوشە خیلەکانو سەرەك

---

« ١ » تاریخ العراق القریب « مس بیل » ترجمە جعفر خیاط سون ئەفسەریکی بەریتانی بو لە رتبەی میجەردا نیوەی تەمەنی سەربازی بە « جاسوسی » لە کوردستانا رابواردوە .

خیلەکان هەمو وەرس بون لە دەست شیخ مەحمود ، بویە هەمو حەز بە ئاسایشں و هیمنی ئەکەن » .

میجر سون بو ئەوەی زیاتر دەسەلاتی شیخ کەم کاتەوە دەسەلاتداریو بەریوە بەری کارو باری خیلی « جاف » کە لە ژیر چاودیری خویا بو لە سولەیمانی گوازتیەوە بو هەلەبجە وە دای بە حاکمی سیاسی هەلەبجە ، بەم جورە دەسەلاتی شیخ کەم بووەو هەرەسی هینا ، سون هەرچی لە دەست هات کردی لە دژ شیخ مەحمود ، بەلام ئایا شیخ مەحمودی قارەمانو نەبەزلەو پیاوانەبو بەم جورە کردەوانە داچلەکیو یان سل لەم جورە پیاوانە بکا ؟ بی گومان نەء ،
بەزینو سلەمینەوە بو شیخ مەحمودی قارەمان نەبو ، شیخ زور باش لەوە گەیشتبو کە بەریتانیا هیزیکی وای نیە پر کیشی بکاو بیتە سەری وە هیزی لیویشں هەمو کوردن وە پەروەردەی دەستی شیخن لە بەر ئەوە شیخ مەحمود لە ٢٠ی مانگی مایسی ١٩١٩دا لە ئینگلیز هەلگەرایەوە وەك لەوە پیشں باسکرا وە هیزی لە ئیرانەوە بو هات ، بەم هیزەوە چوبو بەرەنگاری هیزی بەریتانیا .

★★★

## شـورشـی یەکەمـی شـیخ مەحمـود : ـ

جـەنگی گـەورەی ۱۹۱۹ ز : ـ

قەشـە « جـی . سـتین جونـز » لـە نـاو جەرگـەی ئـەو شەرەدا بـوە وە ئـەم ریپورتاجـەی لـە بـارە ی ئـەو شـەرەوە نوسـیوەو چـی تیـا رویـداوە بـە راسـتی بـی لایەنگـری گـیراویەتـەوە ، کـە لـە گـوڤاری « سـەربازی » ژمـارە « ۲ »ی سـالـی « ۳ »ی ۱۹۲٦دا لـە لایـەن مقـدم ( حسـین نـوری ) نـاوەوە کـراوە بـە عەرەبـی و بـلاو کـراوەتـەوە ، ئەلیـت : ـ

ئـەو جەنگـە دشـوارەی کـە لـە سـالی ۱۹۱۹زدا لـە نـاو بەرزایی و نـزمایـی شـاخەکانـی کوردسـتانی خـوارودا رویـدا شـەریکـی زور تـوندو گـەورە بـو ، ئـەو شـەرە بـو ئـەوە کـرا کـە بـەربەسـتی ئـەو شـورشە بکـریت کـە پـەرە نەسـینی و تەشـەنە نەکـاو بـە هەمو کوردسـتانا بـلاو نەبیتـەوەو خیلـە کوردەکانـی تـر بـەشداری تیـا نەکـەن وەك خیلـی ئـازاو بەهیـزی « جـاف » کـە لـە توانایانـا هەبـو شـەش هەزار چەکـدار بخـەنە نـاو جەرگـەی شـەرەوەو لەم شورشەدا بەشـدار بیـن ، هـوی بـەرپا کـردنـی ئـەم شـورشـە گـەورەیـە ئـەوەبو کـە شـیخ مەحمـود ئەی ویسـت دەولەتیکـی سـەربەخـوی کـورد لـە کوردسـتانا دابمـەزرینیت ، وە ئینگلیـز وازی لـەم بـیرو بـاورە هینابـو وە بـابەتـی دامەزرانـدنی ئـەم حکمـرانیەی لـە میشکی خـوی دەرکـردبو بویـە شـیخ مەحمـود ئـەم شـورشەی بـەرپا کـرد

لـ مانـگی ئایـایاری ۱۹۱۹دا ، ئەم شیخە گەورەترین پیـاوە لە کوردستانی خـوارودا ، حکـومەتی بەریتانیـا لـە کاتـی داگـیر کـردنی کەرکوکدا لە سـالی ۱۹۱۸ حکمـرانی خاکـی کوردسـتانی خـواروی دایـە دەسـت شـیخ مەحمـود .

## شـەری یەکـەم :ـ

« مەحمـود خانـی دزلـی » کـە سـەرولی خـیلـی هـەورامانـی ئـیران بـو لـە کوردسـتانی روژ هەلاتـا وە یەکیـك بـو لـە دوسـتە سـوینـد خـوارەکانـی شـیخ مەحمـود بـە لـەشکـرەوە هـات بـو شـاری سـولەیمانـیو داگـیری کـرد ، لـە یەکـەم هـیرشا ئـەوانـەی سـەر بـە شـیخ بـون هەمـو پشـتیان گـرت ، هەمـو کاربەدەسـتانی ئینگلیـز لـە سـولەیمانی گـیران ، شـیخ مەحمود حکمداریو سەربەخویی گـرتە دەسـت لـە روژی ۲۲ ئایـاری ۱۹۱۹زدا مقـدم « دانلیسـں » بـە هیـزیکی بـە کـری گـیراوەوە لـە کوردەکان لـە گـەل دوو هەزار پیادەو « ٤٠٠ » سـوارا هـیرشی هینـا بـەلام شـکانو هیـزەکەی پـەرشـو بـلاو کـرایەوەو پەریشـان کـرا ، دوو ئەفسـەری ئینگلیـز لـەم شەرەدا کـوژران ، زوریشـں لـە کـوردە بەکـری گـیراوەکـان رایـان کـردە

ناو سوپای کوردستانەوە ، مقدم « دأنلیسس »و چەند کاربەدەستانی تری ئینگلیز بە دیل گیران ، میجەر « سون » نوینەری سیاسی بەریتانیا لە سولەیمانی رای کردو دەرباز بو ، بەم سەرکەوتنە هیزی شیخ مەحمود بە تەواوی سەریان بەرز کردەوە ، لە خوار قەرەداغ هیرشیان بردە سەر کاروانیکی سەربازی کە چەکیان هینابو بو ئینگلیزەکان بو سولەیمانی هەمویان گرتن و چەکەکانیان لی سەندن و دابەشیان کرد بە سەر خویانا •

لە روژی ۲۳ی ئایاردا فەرماندەر « بریدجس » بە هیزیکی بچوکەوە کە پیك هاتبو لە دوو پول رم وەشین وە تیپیك هیندی وە دوو ئوتوموبیلی زریلی و « ٦۰ » سەربازی کوردی بە کری گیراو بە سەروکایەتی کاپتان « لونگریك » یارمەتی دەری فەرماندەری سیاسی کەرکوك ، لە شاری کەرکوکەوە نیران بو یارمەتی دان و رزگار کردنی نوینەرە سیاسیە بە دیل گیراوەکان لە شاری سولەیمانی ، ئەم هیزە زور بە توندو تیژی هاتن بو دەربەندی « تاسلوجە » بی بەرگری ، ئەو شەوە لەوی روژیان کردەوە ، لە بەری بەیانا کوردەکان ئابلووقەیان دان ، دەستیان کرد بە تەقە کردن لی یان ، بە کری گیراوە کوردەکان کە لە گەلیان بون رایان کرد چونە ناو هیزی کوردەکانەوە ، هیزەکەی ئینگلیز پەشوکاو پیکا هات « لونگریك » ناچار بو پاشەو پاشی هیزەکەی گیرایەوە بو ماوەی « ۱۲ » میل بو پشت بازیان ، بە پەلە پروزکی خوی گەیاندە ئەو شوینەو دوو ئوتومبیلەکەشی بە جی هیشت

مەترسی زوریشی لەوەبو کە کوردەکان بچن ریی دەربەندی بازیانی لی بگرن وە ریی نەدەن لە بلەریتەوە بو چەمچەمال ، لەم کاتەدا دەنگو باسی ئەم شەرە گەیشتە بارەگای هیزی بەریتانیا لە « بیجی » لە سەر کەناری « دجلە » لیوای موریس پولیکی بە هیزی بە سەروکایەتی « کندی » فەرماندەری بیپی یەلەمی پولی پینجهەمی روژهەلات کە ژمارەی سەربازەکانی « ٦٤ » بو لە گەل « ١٦ » مەترەلیوز لویس دا بە ئوتومو بیل خیرا ناردی بە دەنگ هیزەکەی « بریدجس »ەوە ئەم هیزە لەو کاتەدا گەیشت کە هیزەکەی « بریدجس »ئابلووقە درابون « کندی » بە زویی مەترەلیوزەکانی لە هەندی لوتکەی بەرز دانا کە سوار بون بە سەر شوینی شەرو بە سەر دەربەندی بازیاندا ، هیزی شیخ مەحمودیان دایە بەر دەست ریژو لیژگەی مەترە لیوز هیزەکەی « بریدجس » ئەمەیان بە هەل زانی کشانەوە لە دەربەندەکە چونە دەرەوە ، ئەگەر ئەم هیزەی « کندی » نەگەیشتایە بە هیزی « بریدجس »دا هەمویان لەو ناوەدا دەکوژران و ئەو شوینە دەبوە گورستانیان کوردەکان سەربازە راکردوەکانیان رادو نا تا کردیانن بە ناو مالەکانی چەمچەمالدا • زیانیکی زوریان لە هیزی ئینگلیز دا • وە ئوتوموبیلی زریلی تریشیان پی بە جی هیشتن لەم شەرانەدا « ملازم پول » لە پولی رم هاویژ ۳۲ کوژرا لە گەل کاپتان «چیشولم»ی هندیدا کە برینداد کراوە دوانیشیان ون بون ، لەم شەرەدا

کوردەکـان دلاوەریـەکی گەورەیـان پیشـاندا بـەرامبەر هیـزی ئینگلیز ، « مـلازم تـومـز » لـە گـەل دوو سـەربـازی تـرا کـە شـەریکـی باشـیان کرد لـە ئەنجـاما کـوژران ، کاروانیکـی تـازە لـە ئوتومۆبیلـی پـ رلـە سـەربازو تفاقـی جەنگـی بـە سەروکایەتـی کاپتان «تومسون» گەیشـتە چەمچەمـال سـەرکـردە « مـار » بەرگـری قـەلای چەمچەمال لـە گـەل پولیـك سـەربـازی مەتـرەلیـوز هـەلگـرو هیـزەکـەی « بریدجس »ئامادە بـون بـو شـەر « بـریدجس » خـوی گـەرایەوە بو کـەرکـوك •

کوردەکـان لـەم ماوەیـەدا هەلیـان بـو هەلکـەوت « شـیخ قادر »ی بـرای شـیخ مەحمـود لـە گـەل « ٥٠٠ » سـوارا لـە روژی ٢٨ ئایاردا چـون بـو دیـی « بنـە » لـە ناوچـەی ژورووی روژ ئـاوای چەمچەمالا کـە چـوار میـل لـە چەمچـەمالـەوە دورە ، ئـەم هیـزە بـو هەرەشـە کـردن وە بەسـتنی ریـی هـاتو چـوی بـەینی کـەرکوكو چەمچەمـال نـیررا بـو ، بـو بەسـتنی ریـی گـەرانـەوە لـەو هیـزەی کە ئابلووقە درابـو لـە نـاو قەلاکـەی چەمچـەمالدا ، لـەم کاتـەشـا شـیخ مەحمود لـە بازیـان جیـگای بـەرگری خـوی قایـم کـرد ، لـە روژی ٢٦ی ئایار ١٩١٩زدا فـروکەیـەك هـات بـویارمـەتی دانـی هیـزی بـەریتانیـا ، لـە سـولەیمانی نیشـتەوە ، کوردەکان دەسـتیان بـو نەبـرد چـونکـە شیـخ مـەحمـود وای دانـا کـە ئـەوانـەی تـیایـان نـوینـەرن لـە بەغـدادەوە نـیرراون لـە لایـەن حاکمـی گشـتی بـەریتانیاوە « ویلسن» بـو گفـتو گـو کـردنو ریکەوتـن لـە گەلیـا ، پاشـی مـاوەیـەك

فروکەکە گەڕایەوە فڕوکە وانەکە لە ماوەی نیشتنەوەی لە سولەیمانی لەوە گەیشت کە نوینەرە سیاسیە بەریتانیاییەکان هەمو ماون ، ئەم باسەی بە گورجی گەیاندە بەغداد . « ١ » .

لەم کاتەدا کاروانیکی ئازووقە هینەر کە بە ناو دولو شیوەکانا بە دزیەوە دەرویشتنو دەیان ویست ئازووقە بگەیەننە هیزە ئابلووقە دراوەکەی چەمچەمال ، لە شوینکا کە ٢٤ میل لە کەرکوکەوە دورە کەوتنە داوی کوردەکانەوە ، هەمویان کوژران ، کەسیان لی دەرنەچوو ، لە سەر ئەمە هیزیکی تر بە فەرماندەی کولونیل « فرایزەر » نیررا بو یاریدەدانو هیرش بردن ، ئەم هیزە گەیشتە « قەرە هەنجیر » کە کەوتوتە بەینی کەرکوكو چەمچەمالەوە وە « ١٧ » میل لە کەرکوکەوە دورە ، پاش یەك دوو سەعات رویشتن چوار دەوریان گیرا بە هیزی « محمود خانی دزلی » سێ روژ ئابلوقە دران لە ناو دولو گردەکانا ، لیژگەی گوللە لە لایەن کوردە نیشانچییە پیکەرەکانەوە وەك تەرزە دەباری ، ئەو هەتاوە سورەو گەرمی روژ گالەی بە هیزەکەی « فرایزەر » کرد ئەگەر هیزی کولونیل « گارت » سەرکردەی توپخانەی شاخی « ٢٢ » نەگەیشتایە بە فریایانا وە کوردەکانی

---

« ١ » استخباراتی بەریتانیا چەند بە هیز بوە لە ماوەیەکی کەما زانیان کە ئینگلیزو بەندیەکان ماون . بی گومان دەنگو باسی تریشیان وەرگرتوە .

نوسەر

نەگیرایەوە بو دیـی « بنـه » بی گومان ئەو هیزەشـس هەمـو لە ناو دەچونو کەسـیان لـی دەر نەدەچوو •

لـە کوتایی مانگی ئایـاردا جەنەرال « موریسـس » سەرکـردەی هیـزی پیـادەی « ٥٥ » نـیرا بو « قەرە هەنجـیر » لەوی بارەگایەکـی سەربازی بەهیـزی دامـەزراند لە سەر سـەرچاوەی ئاوەکە ، دەسـتی کـرد بە خـو کوکردنەوە ، ئنجا فەرمانـیدا کە دیـی « قەرە هەنجـیر » بسوتینـن ، لـە روژی ١ حزیـرانی ١٩١٩دا فروکەکـانی بەریتانیا دەستیان کـرد بـە بومبـا بارانی دیـی « بنـە » بارەگای هیزی پیشەنگی شـیخ مەحمـود ، ئەو روژە زیانیکـی زور لە کوردەکان درا بـەم بونەیەوە هیـزی شیخ مەحمـود ناچار کرا بە گەرانەوە بو دەورو پشـتی شاری سـولەیمانی وە هیـزی « مەحمـود خانی دزلی » بو سـەر سـنوری ئیران ، لە گـەل ئەمەشا هیـزی شـیخ مەحمود روژ بـە روژ زیاتر شـەد گیر تر ئەبون وە بی ترسـس هیرشەکانیان تـا دەورو پشتـی کەرکوك ئەبرد هیزی بەریتانیا تا ئەودەمە زور شـلوق بـو وە زور مەترسـیان لەوە هەبو کە « خیلی جـاف » لە گەل شـیخ مەحمـودا ریك بکەویت وە پشـتی بگریتو لەم شەرە یاریدەی بـدات « ت • فرایزەر » سـەرکردەی فرقەی « ١٨ » تعلیـماتی لـە بارەگـاوە بو هـات کە هیزیکی گـەورە لە کەرکـوك کو بکـاتەوە کە بوبـو بە « پشـاوور »[1] ی عیراق •

---

« ١ » پشـاور شـاریکە لە بەشـی ژوروی هندستان لـە سـەر سـنوری ئەفغانسـتان کارەسـاتی گـەورەی جەنگـی تیـا رویـداوە لە شـەری بەینـی ئەفغانو بـەریتانیـادا •

هیــزیکی زور گــەورەی بەریتانیا لــە دجلــەو لــە هەمــو شــوینەکانی تــری عــیراقەوە رو ی کـردە کــەرکوك بو مەشق کــردن لە ســەر جەنگی شــاخیو شاخەوانــی ، هیــزی فرایــزەر بوە هیــزیکی گەورە لە ســوپای بەریتانیا لە عــیراق ، بەم جــورە « فــرایــزەر » هیــزیکی گەورەی پیکەوە نــاو ئامادەی کــرد بو ناردنی بو ســەر سولەیمانی ، فەرماندەریەتــی ئــەم ســوپا گەورەیــە درایە دەست جەنــرال « ســاندرس » هەر لە کەرکوکەوە تــا ئالتــون کوپریو ئەربیــل ئەمە لەولاوە ، لەم لاشــەوە تــا چەمچەمــال لە روژی ۲۳ی حزیــراندا « تومپســـون » بە هیزیکەوە لە قەلای چەمچەمالەوە هاتــە دەری بو ســەر لی شیــواندن لە کوردەکانو رزگــار کــردنی ئــەو کاروانەی لە دەربەنــدا گــیریان خواردبو وە بو پاك کردنەوەی دەربەند لــە کوردەکان ، لە ناکاو کوردەکــان دایان بــە ســەر ئــەم هیــزەدا لــە نزیــك دیی « بنــە »و ناچاریــان کردن بە گەرانەوە بــو « قــەرە هەنجیر » چونکە ئەم هیزە نەی ئەتوانی بوەســتی بەرامبەر بە هــیرشی کوردە ئازاو جەنگاوەرە شــاخەوانەکان بەلام ئەم هیــزە بەخت دار بــون چونکە جەنەرال « موریس » لە شــوینی ئەم شــەرەوە نــزیك بو ، کە گویــی لە دەنگی تەقە بو چو بــو یارمەتی دانی « تومپســـون » وە بە گورجــی فریای کەوت ، چونکە خــویو هیــزەکەی کەوتبونــە تەنــگو چەلەمەوە ، ئەوەنــدەیان نەمابو کــوردەکان چــوار دەوریــان بگــرن ، هیــزی « موریســس » گەیشــتە فریایــانو لە گەل کوردەکاندا کەوتنە شەر کوردەکان کشانەوە ، هیــزەکەی « تومپســـون » رزگــار بو گەرانــەوە بــو « قــەرە هەنجیر » لــەم شــەرەدا کاپتن « کینگ ســولتەر » لــە هیزی گوزگە که خەلکی ناو شــاخەکانی « همالایــا »

بو له هندستان کوژرا ، له گه‌ل کولونیلیك له لوای « ٥٥ » .

فروکه‌کان هه‌ر خه‌ریکی گه‌ران‌و پشکنین‌و تاقی کردنه‌وه‌ی شوینی کورده‌کان بون ، پاشس تاقی کردنه‌وه‌ی‌و شاره‌زا بونی شوینه‌کانیان فریق « فرایزه‌ر » ده‌ستی کرد به هیرش بردن له هه‌مو لایه‌که‌وه ، له روژی ١٥ی حزیراندا هیزیکی گه‌وره‌ی نارد بو سه‌رشاری‌سوله‌یمانی .

★★★

## *شه‌ری بازیان ـ ترموپیلی کوردستان :ـ

بازیان هیلی به‌رگری کورده‌کان بو ، ده‌ربه‌ندی بازیان ده‌ربه‌ندیکی قایمی ته‌نگه وه‌ك ده‌رگا وایه له شاخی « قه‌ره‌داغ » له شیوه‌ی « ٧ »دا هه‌لکه‌وتوه ، کلیلی ریگای سوله‌یمانی‌یه ، لیره‌دابو هه‌مه‌وه‌نده‌کان سه‌رکه‌وتن به سه‌ر هیزیکی گه‌وره‌ی تورکا ، شاخی « قه‌ره‌داغ » ریزه شاخیکی سه‌خته به‌ره‌و ژوروی روژ ئاوا ئه‌کشی ، کوسپیکی قایم‌و سه‌خته به‌رامبه‌ر هه‌مو هیرش هینه‌ریك ، به‌رزایی له روی ده‌ریاوه چوار هه‌زار پی‌یه وه له سه‌ر روی ده‌ربه‌نده‌که هه‌زار پی به‌رزه له‌م ده‌ربه‌نده‌دا هیزیکی بچوك‌و چه‌ند مه‌ترلیوزیك ئه‌توانی شه‌ر له گه‌ل فرقه‌یه‌ك سه‌رباز

بکات وه ئەم دەربەندە ترمۆپیلی « ۱ » کوردستانە هەر وەکو چون لە کاتی خویا « ۳۰۰ » اسپارتەیی یونانی شەریان کرد لە گەل سوپای گەورەی ئیرانا ئەگەر « ئەفیالیت » « ۲ » ناونەبوایە کە ناپاکی کردسوپای ئیران دەشکاو یونانیەکان سەر دەکەوتن کوردەکان یەك لە دوای یەك هیرشیان بردە سەر هیزی فرایزەر ئەویشس بەرگری دەکرد تا شیخ مەحمودو هیزەکەی هەمو لە ناو شاخەکانی بازیاندا قایم بکاو دەست بکا بە شەریکی دلیرانەو بەرگری ، لە ئیوارەی روژی ۱۷ی حزیراندا پولیك سەرباز چونە سەر ریزە شاخەکانی قەرەداغ وه دوو پولی هیزی بەریتانیایی چونە پیشەوە

---

« ۱ » « ترموپیلی » دەربەندیکە لە تسالیا لە یونان « لیونیداس بە « ۳۰۰ » جەنگاوەرەوە بەرەنگاری « خشایار شاه » شای فرس بو کە هیرشی هینابوە سەر یونان شای فرس لە پیش شەرا نوسراویکی نارد بو « لیونیداس » ووتی چەکەکانت بدە بە دەستە ، ئەویش لە وەلاما ووتی وەرە وەریان گرە لە « ٤٨٠ » پ زدا لە ئەنجاما لیونیداس سەرکەوت . « جغرافیای طبیعی و سیاسی واقتصادی کوردستان ، نوسینی علی اصغر شمیم بە فارسی » لاپەرە « ۳۰ » .

« ۲ » « افیالیت » لە پەرتووکی « انا باسیس »ی کزینفون وەری گرتوه کە خوی سەرکردەی ئەو یونانیاله بوه کە لە ایرانەوە بە ناو خاکی کوردستانا گەراونەوە بو یونان وه بە کوردەکانی وتوه « کاردوخی » یان کورد خوی لە « ٤٠١ » پ ز . « نوسەر »

بـو پاراسـتنی ئـەو پولـە سـەربازە نـەوەك كوردەكـان لـە نیـوە شـەوا بـە ئاگـا بـێنو لـیـیان بـدەن ، ئـەم دوو هیـزە خـویان ئامادە كـرد بو هیـرشی بەیـانی لـە بـەر ئـەوە ئـەو شـەوە كەسـ لـەو سـەربازگاو بارەگایـەدا نەنوسـت ، لـە بەیانـی روژی ١٨ی حـزیرانـدا دەسـت كـرا بە هـیرش بـردنو پەلامـار دانو جەنگـین دوو پـولـە سەربازەكە لە نیـوە شـەوا شـوینی بەرگـری خویـان قایـم كـردبـو ، یەكـەم پولـی هـیرش بـەر بەتالیونـی « ٨٥ » ی بو رمـابو كە پیـك هاتبـو لە سـەربازی « سـیك » و « گورگـەو » « كاجنیسـی » كە ئەمانە هەمـویان لـە رەگەزی ( مەغـول )ن لە بورمـا دادەنیشـن ، ئەمانـە هەمو شـاخەوانـن ، هەلگـەران بە شاخەكانی ئەمبـەروئەوبەری دەربەندەكـەدا وە ئەمـەیان پی سـپیررا بو وەسـتان بەرامبـەر لای راسـتو لای چەپـی كوردەكـان تا بتالیـونی « ایسـت سـری » لـە ژیـر فەرمانـدەی « رۆ » بتوانی پیشكـەویت وە بتالیـونی « ٨٧ » لە ناوەراسـتا بو بە پـال پشت ، لـە تاریـكو لیلـی بەیانـدا توپەكـانو مەتـرەلیوزەكان شـوینی خـویان گـرت ، بەتالیـونی « ایسـت سـری » لە سـەرەتای جـەنگـا زور بـە سـستی سـەر دەكەوتـن ، تا تەتەریـك یە هەلە داوان هـات لـەلایـەن جەنەرال « مـوریسـ »ەوە بو لای فەرمانـدەر پـیی ووت كە بە توندیو گورجـی پیشكـەون چونكـە تەقە نیـەو بەرگریشـ نیـە لـە پشـت شاخەكانـی بازیانـدا ، وا دەركـەوت كوردەكـان هیشـتا لـە پـرخەی خـەوی شـیرینا بـون ، پاشـ پیشكەوتن لە چیشـت هەنگـاوا كوردەكان دەسـتیان كـرد بە تەقـە ، گویمان لە دەنگی تەقـەی مەترەلیـوزی ئەلمانی

بو که هیچ چاوەری نەدەکرا شتی وا ببی لە لای کوردەکان ، بەلام تەقەکان زوری پی نەچو بی دەنگ بو ، ئنجا بە تەواوی هیرشی دەست پی کرا ، توپەکانی بەریتانیا بە ئاسانی دەربەندیان داگیر کرد بەلام لەم شەرەدا هیزی بورما زیانیکی زوری لی کەوتبو ، چونکە دەستەو یەخە لە گەل کوردەکانا بە خەنجەرو قەمەو سونگی شەریان کردبو وە کوردەکان لە شەرە خەنجەرو دەستەو یەخەیدا زور دلیرو ئازاو دەستی بالایان هەیە ، ئەم شەری دەستەو یەخەیو شەرە خەنجەرەی کوردەکانو بورمایی‌یەکان دوو سەعاتی خایاند ، کوردەکان کشانەوەو گەرانەوە بو هیلی دووەمی بەرگریان وە زوریشیان بەرەو سولەیمانی رایان کرد ، وردە شەر لە دولو چەمەکانی بازیاندا هەر هەبو تا « شیخ مەحمود » « ۱ » بریندار کرا لە گەل « شیخ محمد غریب »ی زاوایا بە جوتە بە دیل گیران .

---

« ۱ » مشیری حەمەی مام سلیمان هەمەوەندی جاشی هیزی بەریتانیای لە پشتەوە لە لا ریوە سەر خستە سەر شاخی « قەرەداغ » وە شوری کردنەوە بە سەر دیوی دەربەندا ئنجا لە پیش سوپای بەریتانیاوە بو کە شیخ مەحمودو شیخ حەمە غریب بریندار کرانو خویان خستە ژیر بەردە قارەمانەوە کە نەناسرینەوە تا دەرباز دەبن مشیری جاش هات ناسینیەوە ووتی ئەوە شیخ مەحمودە ئەوەش شیخ محمد غریبە کە زاوایەتی هەردوکیان بە دیل گیران . — نوسەر —

ئنجا هێزی بەریتانیا بێ بەرگری چونە شاری سولەیمانی نوێنەرە سیاسیە ئینگلیزەکان کە گیرا بون هەمو لە بەندیخانە دەرهێنران لە روژی ٢٠ حزیران ١٩١٩زدا « فرایزەر » بە هێزەکەیەوە گەیشتە سولەیمانی ، حکمرانی شێخ مەحمودو حکومەتی ساوای بەد بەختی کوردستان کوتایی بە تەمەنی هات ۰ ! ! ۰

شێخ مەحمود دوای چاپونی برینەکەی لە بەغداد درایە دادگای مدنی حکمی اعدامیان دا ، لە دوایدا حکمەکەیان گوری بە دە سال بەندیو دوریان خستەوە لە عیراقو کوردستان ناردیان بو دورگەکانی « ئەنداماان » لە هندستان ، ئەم شورشو روداوانە هەموی لە ناوچەی سولەیمانیو کەرکوکدا رویدا ! ! ۰

## ناوچەی قەلادزەو رانیەو رەواندزو وانو باشقەلا : ـ

خوا لێی خوشبو ئەحمەد تەقی یادداشتێکی دەست خەتی نوسیوە لە پیش کوچی دوایی‌دا دەربارەی ئەو روداوانە کە رویداوە لە ناوچەکانی « قەلا دزە »و « رانیە »و « رەواندز » لە لوای هەولیر وە « وان »و« باشقەلا » لە کوردستانی ئیراندا چونکە ئەحمەد تەقی خوی یەکێکە لەو پیاوانەی کە بە کردەوە لە کردنی ئەو روداوانەدا بەشدار بوەو دەستی بالای هەبوە !۰

ئەحمەد تەقی کە لە تورکیا گەرایەوە لە گەل کوردەکانی هاوری‌دا لە پاش « موتارەکە » وەستاندنی شەر ، لە

ئەستەموولەوە نامەیەکی تایبەتی لە شیخ عبدالقادری نەهری‌یەوە هینا بو شیخ مەحمود وە ئاموژگاریەکی بە دەم راسپاردەشی پی بو کە بە دەم بە شیخی رابگەیەنیت ئەحمەد تەقی نامەکەی گەیاندە شیخو راسپاردەکەشی پی راگەیاند کە وتبوی تکایە بە شیخ مەحمود بلی « من ئەزانم ئینگلیزەکان ئیدارەیەکی وەختیان پیک هیناوە بە سەروکایەتی ئەو ، بەلینی دامەزراندنی حکومەتی کوردستانیان داوە بە ئیمە ، بەلام وەك بیستومە ئیستا لە گەل شیخ مەحمود باشن نین ، وە لە گەل ئیمەشا راست نین ، بەلام دیشان تکا لە شیخ مەحمود ئەکەم چەند لە توانایا هەیە ئیدارەیان لە گەل بکاو تیکی نەدا لە گەلیان ، تاکو بزانین دەربارەی کوردستان چ جورە بریاریك ئەدەن » .

شیخ مەحمود لە وەلاما بە ئەحمەد تەقی ووت « من لایەنگری ئەوەم ئیدارەیان لە گەل بکەم ، بەلام ئەوان شەرم پی دەفروشن‌و هەول ئەدەن بو نزمی‌و بی دەسەلاتیم » ئنجا شیخ مەحمود هەوالی خەلیفەو تورکیای پرسی بو ئەویش وتبوی زور لە ژیرەوەن ، لەو کاتەشا میجر سون بوبو بە حاکم لە سولەیمانی ، شیخ مەحمود بەم حاکمیەی سون زور تەنگە تاو بوبو ، روژیك لە کاتی دیدەنی ئەحمەد تەقی‌دا شیخ وتویەتی ، « نیازم وایە نوینەری خوم بنیرمە « تاران » لای بالبوزە بیگانەکان سکالای خوم دەربرم دەربارەی خراپی ئینگلیز » ، ئەحمەد تەقی

لـه وەلامـا وتبـوی قوربـان « تـاران »و« ئەسـتەموول »و هەمـو جهان
لـە ژیـر دەسـەلاتی ئینگلیـز دایـە بـاور ناکـەم سکـالا کـردن کاری
تـی بکـا ، شـیخ لـەم وەلامـە دلگـیر بوە بـە تورەیی‌یەوە گەراوەتەوە
بـو مالـی لـەوی بـریاری داوە کـە بـە زوویی « سید احمدی مرخص »
کـە بـە « دان زیـرین » بـە ناو بانگـە بنـیری بو « تـاران » بو سکـالا
کـردن‌و بیـزاری دەربـرین لای بالیـوزی دەولەتـە بیگانەکان بەرامبـەر بە
کـردەوە چـەوت‌و نارەواکـانی بەریتانیا کـە ئەیکـا لـە کـوردسـتاندا
بـەرامبـەر بـە شـیخ مەحمـود ، زوری پـی نەچـو بەینـی سـونو
شـیخ مەحمـود بە تەواوی تیك چـو وە لـە یەك ئاشـکرا بـون ،بـوە
شـەر لە بـەینی شـیخ‌و ئینگلیـزاو شیـخ گـیراو کەسـ‌و کـاری رایان
کـرد چـون بـە دیـوی ئیر انـا ، کـە ئەحمـەد تەقـی زانـی بـار لـە
سـولەیمـانیدا بـەرەو خـراپە ئـەروا چـو بـو قەلا دزە بـو دیـدەنی
عباسـ ئاغـای مەحمـود ئاغـا ، کـە گەیشـتە قەلا دزە لـە دیی نورالدین
چـاوی بـە عباسـ ئاغـا کەوت لـە گـەل ئاغـای قەرەنـی ئاغـادا ، لەو
کوبونـەوەیـەدا عباسـی مەحمـود ئاغـا نارەزایـی دەربـری بەرامبـەر
بـە کـردەوەکانـی « میجـەر سـون » ووتـی « سـون » لـە گـەل
بابکـر ئاغـادا دەسـتیان تیکـەل کـردوە کـە ئیمـە بکـەن بـە نوکەری
خویـان ، ووتـی پاشـ هاتنـی « میجـر سـون » لـە کاتـی فـەرمان
رەوایـی شـیخ مەحمـودا ئیمـە چوینـە سـولەیمانـی‌و لای شیخ مەحمود
میـوان بوبـن دابـرەی سـیاسی داوای هاتنـی کـردبوین ، یەکەمجـار
دیـدەنـی « میجـر گرینهـاوس »مـان کـرد لیـی پـرسـین بوچـی

هاتــون بــو ســولەیمانی ، لە ســەر داوا کــردنی شــیخ مەحمــود هاتــون یــان خوتــان هاتــون ؟ عباســ ئاغاشــ لە وەلامــا ووتــی : ـ خومــان هاتویــن بو دیــدەنــی ، زور ســەرمان ســور مــاوە لــەم پرسیــارانــە چەنــد وەختیــك لەمــەو پیشــ هــەر کاربەدەســتانی ئــینگلیــز بــون ئیمەیــان داوا دەکــرد بــو دیــدەنــیو قبــول کــردنی حکــمرانی شیــخ مەحمود ، ئیســتاش لیمــان دەپرسنەوە بوچی هاتوین بو لای شیخ مەحمود ؟ وا دەزانــن ئیمــە مەیمونــین هــەر روژە بــە جــوریك هەلمــان پەرینــن • ئیتبــر میجــەر « گــرین هاوســ » چــو بــو لای « میجــەر ســون » ئیمەشیــان بــردە لای خــویان « ســون » لــە هــەوال پرســینو بەخــیر هاتــن بەولاوە پرســیاری نەکــرد ، نــەو روژەوە « ســون » من بە دوژمنی گــەورەی خــوی دەزانــی ، ئەحمەد تەقــی لــەو گــفتو گــو کــردنــە لــە گــەل عباســ ئاغــا بــریاریــان دا کــە هــەول بــدەن بــو خەلــك کوکــردنەوە لــە دەورو پشتی خویــان بــو تیکــدانی بەریوە بــەری کارو بــار لــە « ســون »و لە « بابکــر ئاغــا » لــەو ناوچــانەدا ، ئــەحمــەد تەقی بەهــوی دوســتەکانیەوە کــردبــان بــە مەئمــوری خەمــل کــردنی بــەروو بوومــی زســتانــی لــە ناوچــەی پشــدەردا ، بــەو بــونەیەوە بــی تــرس کەوتــە گــەرانو دیــدەنی ئاغــاکان ، دیــدەنی عباســ ئاغای کــردەوە وە زوریشــ لە ئاغاکانــی ناســیوە چــو بو دیــدەنی « شــیخ محمــد امــین ســندولان »و هاوریکانی لــە گــەل « بایــز ئاغــای عباس ئاغــاو »و « صــالح ئاغــای ئەحمــەد ئاغــا » وە لــە گــەلیان ریــك کەوت پاشــ تەواو کــردنی خەملــی زســتانی بەختیــاری ئەحمــەد تەقــی وە

بەختیاری تورکەکان وای هینا کەحاکمی سیاسی دەربەند داوای ئەحمەد تەقی کرد کە بە تایبەتی بی‌نیرن بو خەملی ناوچەی « رانیە »و « شاورایەتی » لەوی دیدەنی یەکە دوژمنی ئینگلیز وە بابکر ئاغا « فتاح بەگ »ی کرد وە لە لای میوان بو ، لە لای ئەو زانی کە نارەزا مەندان لە ناوچەی « کویسنجاق »دا زورن •

« حاجی رسول ئاغا »ی شاور زور عاجزە لە حکومەت ، ئەحمەد تەقی خوی گەیاندە حاجی رسول ئاغا لە دی « گولان » دیدەنی کرد ئەویش ئاگاداری کرد کە لە رەواندوز کورانی « باویل ئاغا »و« حەمە شین سەرچیاو »« خدر ئاغای » کوری لە گەل « شیخانی بجیل »و « شیخ کاکە ئەمین سەلان »هیرشیان بردوتە سەر « رەواندز » وە « ئیسماعیل بەگ »و حاکمی سیاسی ناچار بون لە ریگای ناو دەشتەوە رایان کردوە بو دەربەند وە لەویشەوە بو « کویسنجاق »و هەولیر ، ئیستا رەواندز بە دەست شورشگیرانەوەیە ، « غفور خان »ی ناو دەشت کە لە دەست بابکر ئاغاو حاکمی سیاسی دەربەند رای کردوە چوتە رەواندز ناو شورشگیرانەوە ، بەم جورە جولانەوەکە زور پەرەی سەندوە وە مخابەرەشیان کردوە لە گەل والی « وان »دا « ١ » ، ئەحمەد تەقی

---

« ١ » واتە بابەتی کوردستان‌و حکومەتی کوردستان نەما گورراپەوە بە تورکچیەتی‌یەکەی جاران • — نوسەر —

گـه ئەمانـەی زانـی زور بـه پەلـه خەملـەکەی کـردو گـەرایـەوە بو « رانیـه » چـوه لای « فتـاح بـەك »و بـەم دەنگـو باسـەی پـی راگەیانـد ، ئنجـا چو بـو « سـندولان » لەویشـی شـیخ محمـد نەمینی تیگەیانـد کـه ئـەم دەنگو باسـه بگـەیەنیت بە عباسـی ئاغـا .

خوشـی لـەویـوه چو بـو « قەلادزه » لـەو کاتـەدا « ماجـد مصطفی » هاتبـو بـو « قەلادزه » بـه نـاوی ئیشـی‌و کـاری بازرگـانیەوه ، ئەحمەد تەقـی بـریاری‌دا بچـی بـو « رەوانـدوز » بـو نـاو جـولانەوەکـەو بەشـدار بـون لـه گەلیانـدا ، لـه سـەر ئـەوە هاتـه « سـندولان » ، عباسـی ئاغاشـی هـات بـو ئـەوی ، لـه پاشـی گفـت‌و گـو کـردن ئەحمـەد تـەقی چوبو رانیـەو شـاوور لەویشـەوه بـو دیـی « سـەلان »و « رەوانـدز » لـەوی لـه مالی « غفـور خـان » مـیوان بـو ، شـورش گیران هاتنـه لای ، ئەویشـی بـاری ناوچەی « رانیـەو »و « قەلادزه »ی تی گـەیانـدن هەـموو پیکـەوه کوبـونـەوه لـەو کوبـونەوەیەدا« باویـل ئاغـا »و نـوری کـوری‌و حەمـه شـینی سـەر چیـاو خـدر ئاغـای کـوری‌و شـیخانی بجیـل‌و شـیخ کاکـه امینـی سـەلان‌و ئەحمـەد بەگی بگـولك‌و زوری تریشـی بەشـدار بـون ، ئەحمـەد تەقـی باسـی پشـدەرو رانیـەو هەسـت‌و بـیرو بـاوری دانیشـتوانی ئـەم دوو ناوچەیەی بـو کـردن ، ئەوانیشـی باسـی ناوچـەکانـی خویـان کـرد ، لـه پـیلان‌و نەخشـەی بجولانـەوەکەیان دوان ، هەمـو مەبەسـت‌و ئامانجیـان‌ئەوەبو پەیوەنـدی پەیـدا بکـەنەوه لـه گـەل دەولـەتی عوسـمانیداو هیناتـی هیـزیکی تـورك تاکـو هەمـو پیکـەوه شـان بە شـانی یـەك شـەر لـه

گەل ئینگلیزا بکەن لەمە بەولاوە هیچ مەبەستو ئامانجی تریان نەبو وە سەر بەخوی‌و ئازادی کوردو کوردستانیان بە هیچ جوریك بە یادا نەهاتبو وە نەدەهات چونکە هەمو لایەکیان دلیان لە ئینگلیز رەنجابو باوریان پی‌ی نەمابو ، وە هەمو لەو بناوەرەدا نەبون کە کورد ئەتوانی بە تەنیا بەرگری خوی بکاو مافی خوی بسینی ئەگەر یەك بن ، شیخانی بجیل خویان لە قەزای عەقرەوە رایان کردبو چونکە لە سەر داوا کردنی زیباریەکانو شیخی بارزان ، ئەم شیخانەی بجیل شەریان لە گەل ئینگلیز کردبو وە چەند ئینگلیزیکیان کوشتبو لە ئەنجاما بەزیبون وەرایان کردبو بو ناوچەی « رەواندز » • ئینگلیزەکان یوسف بەگی یگوکیان کوشتبو لە بەر ئەوە براکەی ئەی‌ویست تولەی براکەی لە ئینگلزەکان بسینی ، باویل ئاغاو کورەکانی دوژمنایەتیان هەبو لە گەل ئیسماعیل بەگ‌و ئینگلیزەکان‌و دوستی ئیسماعیل بەگ بون ، جا ئەم قین لە دلانە هەمو پیکەوە کوبوبونەوە لە رەواندز بی ئەوەی ئامانجیکی سیاسیان بی لە تولە سەندنی عەشایەری بەولاوە مەبەستی تریان نەبو ، بەم جورە هیرشیان هینابوە سەر رەواندز تەنیا مەبەستیان ئاژاوە نانەوەو هەرا بەرپا کردن‌و گوبەند نانەوە بو بەس ، کاك ئەحمەد تەقیش ئەو ئامانجەی کە بە دوایا عەودالی بو لە دەمیکەوە بو کومەلیکی وا ئاژاوە نیرەوەی بی مەبەست دەگەرا کە ئەو مەبەستە شارراوەی کە پەچنی بویە دلی‌و شاردبویە ئەمرو ئەو مەبەستە بەم کومەلە بی ئامانج‌و مەبەستە بەریتە ،

سه که به سه‌به‌ر زاری ناوی نابو کوردایه‌تی‌و خوی وا پیشان ئه‌دا که کوردایه‌تی ئه‌کیا که‌چی یه‌کیك بو له تورکیزمه توخبه خه‌سته‌کان که له تورکیاوه بو ئه‌م مه‌به‌سته نیررابو ، رق‌و دوژمنایه‌تی ئه‌م کومه‌له به‌رامبه‌ر ئینگلیز گه‌یشتبوه‌راده‌یه‌کی وا که به تونندی هه‌ول بده‌ن بو هینانی هیزیکی تورك بو ره‌وانیدز .

ئه‌مه دوا بریاری ئه‌و کومه‌له بو له‌و کوبونه‌وه‌یه‌دا ، له‌م روه‌وه نوسراویان نارد بو والی تورك له « وان » ئه‌ویش وه‌لامی نوسراوه‌که‌ی دابونه‌وه ، له‌و وه‌لامه‌دا هانی داون بو فراوان کردنی جولانه‌وه‌که‌یان ، وه داوای لی کردن که هه‌ول بده‌ن ئه‌و ولاته‌ش بخه‌نه‌وه باوه‌شی « دایکی نیشتمان » « ۱ » که تورکیایه !

ئه‌مانه ویستیان که اسماعیل ئاغای سمکوشیان له گه‌ل بیت نوسراوبکیان بو نارد داوای یارمه‌تیان لی کرد ، ئه‌ویش که زانی ئه‌مانه جولانه‌وه‌که‌یان بی سه‌ری‌یه‌و ئامانجیکی نیشتمانی تیا نیه یارمه‌تی نه‌داو وه‌لامی نه‌دانه‌وه ، شورش گیران دوا بریاریان ئه‌وه‌بو که به هه‌ر جوریك بی ئه‌بی هیزیکی تورك بهینن که به یه‌که‌وه به‌رگری بکه‌ن به‌رامبه‌ر ئینگلیزه‌کان ، ئه‌حمه‌د ته‌قی ئه‌لیت « که تی‌گه‌یشتم بیرو باوری ئه‌مان وه بیرو باوری دانیشتوانی ناوچه‌ی « قه‌لادزه‌و رانیه » وه‌ك به‌که بویه منیش قایل

« ۱ » دایکی نیشتمان مانای خاکی تورکیایه وه کوردستانیشیان به خاکی تورکیا داناوه .

بوم بەو داوا کردنەی کە لیم کرا کە بیم بە باوەر پی کراوی هەموویان بچمە « وان » وە لە گەل والی « قدری بەگ » بدویم بو هینانی سەربازو « ۱ » چەکو تفاقی جەنگی بو رەواندز

## ناردنی ئەحمەد تەقی بو نوینەری کوردستانی خوارو بو تورکیا :-

ئەحمەد تەقی لە گەل « فەتاح شانەگەر » ناودا کە تەتەریکی تورکەکان بو وە خەلکی شاری سولەیمانی بو تەتەری ئەکرد لە بەینی والی « وان »و شورش گیرانی رەواندزدا پیکەوە رویشتن وە ئەحمەد تەقی بو بە نوینەری کوردستانی خوارو ، لە کوتایی تشرینی یەکەمی ۱۹۲۰دا لە رەواندز دەرچون بەرەو « نەهری » مەرکەزی شمدینان بە ری کەوتن ، پاشی سێ روژ گەیشتنە « نەهری » ئەم دییە لە جەنگی روسا ویران کراوەو بوە بە کەلاوە لەوی ئەحمەد تەقی چوە بو دیدەنی « مەفرەز قوماندانی »و « وەکیلی قائمقام » بە خوشیەوە هاتون بە پیریەوەو پیشوازیان کردوەو میواندارییان کردوە ، لە کاتی دواندا بوی دەرکەوتوە کە « مەفرەزە قوماندانی »ناوی « محمود فضل »ە عەرەبی عیراقە

---

« ۱ » ئەحمەد تەقی لێرەدا دەری خست کە خوی یەکیک بوە لە بەرەی جل خوار « تورکیزم »ەکان کە بە تایبەتی لە ئەستەمولەوە بو ئەوە هاتوتەوە کە ئاژاوە بنیتەوە لە کوردستانا بو تیکدانی سیاسەت لە ئینگلیزەکان لە ناوچەی کوردستانی عیراقدا . — نوسەر —

ئـەو لە ئەحمـەد تەقـی گەیـاند کـە ئیسـتا لـە تورکیـا « ئەەنجومەنی نەتـەوەی گـەورە » پیـك هاتـووە بە سـەروکایەتی « مصطفـی کمـال » وە کـوردەکانـی کوردسـتانی ژورو لـە گەلـی ریـکن وە ولاتـی روژ هەلات هەمـو پەیـوەندی خویـان بـری لـە گـەل ئەسـتەمولدا ،قەدری بەگـی والـی « وان » کـوردە خەلکـی دیـار بەکـرە ، ئیسـماعیل ئاغای سـمکوش ئیسـتا لـە گـەل تورکـا زور دوسـتە وە بە ئـازووقە ناردن یـارمەتی بەشـی روژ هەلات ئـەدات .

پاشـی دە روژ مانـەوە لـە « نەهـری » ئەحمـەد تەقـی چـو بـو دیـدەنی ئیسـماعیل ئاغـای سـمکو ، لـە دوای دوان لـە گەلیـا بـوی دەرکـەوت کـە بـیرو بـاوری ئیسـماعیل ئاغـای سـمکو زور جیـاوازە لـە بـیرو بـاوری کوردەکانـی رەوانـدزو رانیـەوقەلادزە ،ئیسـماعیـل خـان لە قسـە کـردنا وتـی : ــ « ئیسـتا ئینگلیـز زور بەهیـزە ، مجادلە کـردن لە گەلیـا لـە بـارەی کـوردەوە زور گرانـە ، بـاور ناکـەم تورکی زەبونیشـی بتوانـی بـە ناردنـی هیـز بـو ئـەوەی دەسـت بخاتـە کارو بـاری سیاسـی رەوانـدزەوە ، چاکتریـن شـت بو کـورد ئەمـرو ئەوەیە لـە ئـیرانا جولانـەوەمان یەك بخەیـن ، وە بونـی خومـان لـە ئـیراندا بپاریـزین ، ئەمـە بو بـاری ئەمـرومان زور باشـە ، وە لە دوا روژا ئەتوانین کەلکـی زوری لـی وەرگریـن » !

ئەحمـەد تەقـی وتویـەتی عباسـی ئاغـای مەحمـود ئاغـاو هاوریکانی ئـامادەن بـو قبـول کـردنی ئـەم بـیرو بـاورەی ئیـوە ، لـە گـەل

ئیسماعیل خاندا بریاریان داوه بچن بو ناو « مامشس » لەویشەوە بنیر نبه دوای عباسس ئاغاو هاوریکانیا ، لەم کاتەدا بروسکەیەك لە والی « وان »ەوە هاتوەوە داوای ئەحمەد تەقی کردوە ، ناچار ئەحمەد تەقی گەراوەتەوە بو « وان » لەوی زور هەولی داوە بو ناردنی مەفرەزەیەك سەربازی تورك بو رەواندز ، لە « وان » مەحمود جەودەتی دیوه کە لە سولەیمانیەوە لە دەست « میجەر سون » رای کردوەو پەنای بردوتەوە بەر « تورك » وە فەرماندەری هیزی ژەندرمە بو لەو ناوچەیە ، لە دوایی‌دا تورکەکان بریاریاندا مەفرەزەیەك سەرباز بنیرن بو رەواندز لە ژیر فەرماندەی « محی‌الدین بەگ » ناودا ئەحمەد تەقی کە ئەمەی بیست روری پی خوشبو بە گورجی « فەتاح شانەگەر »ی نارد بو رەواندز بو ئەوە بە هاتنی مەفرەزەکە کوردەکان ئاگادار بکا ، وە هەر وەها پیاویکی تریشس کە « حەمید »ی ناو بو لە گەل قومیسەریکا نیرراز بو پشدەر بو لای عباس ئاغا بو ئەوەی لە بیرو باوری ئەوانیشس بگەن وە هەر وەها تورکەکان ویستیان راستی‌و دروزنی ئەحمەد تەقیش تاقی بکەنەوە تا بتوانن پشتی پی ببەستن ، پاشس ماوەیەك فەتاح لە رەواندزەوە گەرایەوە ووتی رەواندزیەکان بە پەروشەوە چاوەربی مەفرەزە دەکەن ، هەر وەها « حەمیدو قومیسەر »ەکەشی لە پشدەرەو هاتنەو ئەوانیشس هەر وایان ووت ، ٠

بەهار بو مانگی نیسان ١٩٢٢ز فەرماندەر محی‌الدین بەگ وە دوو ئەفسەرو توپیك‌و دوو مەترەلیوزو ٢٠ یان ٣٠ سەربازی تورك

هەنـدیك تفاقـی جەنگـیو چـەند تفەنگیـك درا بـە مەفـرەزەکە ، بـەم جـورە ئـەم مەفـرەزە شـرە پەرپـووتـەی تـورك نـیران بـو « باشـقەلا » بلوکـە سـەربازەکانـی کـە لـە نەهـری بـون ئەوانیشـ چونـە نـاو ئـەم مەفـرەزەیەوەو بـونە یـەك هەمـو ژمـارەی سەربازەکان گەیشـتە « ١٠٠ » سـەرباز ، ئەحمـەد تەقـی لـە باشـقەلاوە چـو بـو لای ئیسـماعیل ئاغـای سـمکو ، کـە چـاوی بـە ئیسـماعیل ئاغا کەوتو باسـی مەفـرەزەکەی بـو کـرد کە دەنـیریت بـو رەوانـدز ، ئیسـماعیل خـان کە ئەمـەی بیسـت زور گـرژ بو وە زوری پـی گـران بـو بـەلام بە سـەر زاری دەری نـەبری ، فارسـ ئاغـای زیـاری کـە پەنـای بردبوە بـەر ئیسـماعیل ئاغـا بـریاری دا لـە گـەل ئـەم مەفـرەزەیەدا بگەریتەوە فارسـ ئاغـا « ٣٠٠ » چەکـداریکی لـە گـەلدا بـو .

## گەرانەوەی ئەحمەد تەقی لە گەل مەفرەزەیەکی تورك بو رەواندز : ـــ

ئەحمـەد تەقی پاشـ چەنـد روژیـك مانـەوە لای ئیسـماعیل ئاغـا لـە گـەل فارسـ ئاغـاو سـوارەکانیدا چونـەوە بـو « نەهـری » بو نـاو مەفـرەزەکە ، محی الـدین بـەگو ئەحمـەد تەقـیو چـواردە سەرباز لە پیشـەوە چـون بـو رەوانـدز بو دەمـە تەقی کـردن وە دوان لـە گەل دانیشـتوانی ئـەو ناوچانـەدا وە نـە دەمو دوانیـانو بـیرو بـاوەریـان گەیشـتن بەرامبـەر هاتنـی ئـەو مەفرەزەیە ، ئەگـەر دییـان لـە رەواندز کـارو بـار بـە دلـی ئەمـان ئـەروا ئـەوا دەنگـی هەمـو مەفـرەزەکە ئـەدەن بـین بـو رەوانـدز ، لـە ریگـا سـعید بـەگی بـرادوسـت هات

بـه پـیریانەوەو میـوانداریەلی گـەرمی کـردن ، ئنجـا لەویـوە رویشتن تا گەیشـتنه رەوانـدز ، لـەوی لـه دوای پیشـوازی کـردن هەمـو داوایان لـه محـی‌الدین بـەگ کـرد کـه بـه پەلـه مەفـرەزەکه بی‌نیت ، محی‌الدین بـەگ چوەوه بـو « نەهـری » چـاوەری وەلامـی بـروسکەکەی بو بـو بـریار دان لـه سـەر چوونـی مەفـرەزەکه بـو رەوانـدز بروسـکەیەك هـات ئەلیـت « مەفـرەزەی شـەمدینان تیکـەل به جەبهـەی الجـزیره ببی وه محـی‌الدین بـەگ مەفـرەزەکەی بـداتـه دەسـت محمـود فضـل وه خـوی بچـی بـو جەبهـەی روژهەلات » لـه سـەر ئەمه چوونی مەفرەزەکه بـو رەوانـدز وەسـتینرا ، « ۱ » ئەحمـەد تەقی چـوەوه بـو شـەمدینان وه لـەوی مایـەوه کـردیان بـه « وکیلـی قائمقام » لـه نەهـری ، دوای مـاوەیەکی دورو دریـژ بـریار درا ، که مەفـرەزەکه بنـیریت بو رەواندز .

مەفـرەزەکه لـه ژیـر فەرمانـدەی « محمـود فضـل »دا چـون بو رەوانـدز لـه ریگـا « محمـد ئاغـای وەلاشـس » وه « محمـد علـی ئاغای جندیان » زور له دژ هاتنـی ئـەم مەفـرەزەیه بـون بویـه له دیـی جنـدیان کوبونـەوه بریـاریان دا که نەیەلـن ئـەو مەفـرەزەیه تیپـەر ببـی

---

« ۱ » بـروانـنـه نـەتەوەی کـورد لـه لایـەکەوه داوای سـەندنی مافـی نەتـەوایەتـی‌و سـەربەخویی ئەکریـت ، له لایەکـی تریشـەوه داوای گەرانەوەی تـورك ، ئەمـه ئـەوه دەردەخـا که سـەربەستی‌و سـەر بەخـویی خـوازی‌و نیشـتمان پەروەری بـه نـاو کـوردا بـلاو نەبوبـووه تـەواو لـەو کاتـەدا .

نووسەر

تورکەکـان دوو توپیـان نا بـە دیی جنـدیانەوە هەمـو رایـان کـرد ، ئنجا گەیشتنە رەوانـدز لـەوی کومەلیکیـان پیکـەوە نـا بـە نـاوی کومەلی « نەتـەوە » وە « شـیخ رەقیـب »یـان کـرد بە سـەروکی ئـەم‌کومەلە ، ئەحمـەد تەقـی بـو بـە نایبـی سـەروك ، غفـور خـانو باویـل ئاغـاو شـیخ کا کـە ئەمینـی سـەلان ، وە شـیخ جـواد سـەرەکی برادوستو خـدر ئاغـای سـەرچیا بـونە ئەنـدام ، ئەحمـەد بـەگـی بگـوك کـرا بـە قائمقام لـە رەوانـدز ، وە نـوری باویـل ئاغـا بو بـە فەرمانـدەی پولیـس ، شـەوکەت ئەفەندی کـرا بـە شـارەوانی شـاری رەوانـدز ، بـەم جـورە ئیـدارەی تـازە گـیراو لیسـتەی نـیررا بـو « وان » « ۱ » کە لـە ژیـر دەسـەلاتی تورکیادا بـوبو بـریار دان لە سەری ، وەهیزبکیش پیکهـات بـە نـاوی هیـزی « نەتـەوە »وە بە سـەروکایەتـی سـەرەك خیلـەکان هەنـدیك تفەنـگو تفاقـی جەنگـی دابەشـن کـرا بـە سـەر ئـەم هیـزەدا ، بـەلام خـواردەمەنـیو ئازووقـەی ئـەم هیـزەو « ۱ »

---

« ۱ » رەواندز بـە زور کـوردەکـان کـردیـان بـە ولایەتیـك لە ولایەتەکانی تورکیا وەك نامەکەی والـی « وان » وتبـوی بـا بگـەریتەوە باوەشـی دایکـی گـەورە کـە تورکیـایە .

« ۱ » هیـزیکی کـورد ئـەوەندە پـەراگەندەو برسـی بـی لـە سـەر زگـی دیهـاتیە هەژارەکانـی کوردسـتان خوشـان ژیەنـن کـە بـە نـاو هاتـون بـو بوژانـە ەی ناوچەکەیـانو رزگـار کردنیـان ، ئەبـی چ ئومیـدیکی پی بکـرێت وا دیـارە ئەحمـەد تەقـیو شـورشگیرانی رەوانـدز هیـچ هەسـتیـان بـەم کـەمو کورتـەی تورك نەکـردوە .  — نووسـەر —

مەفـرەزەی تـورك هەمـوی بە سـەر شـانی دانیشـتوە هەژارەکانـی ئەو دیهـاتانـەوە بو کـە لـە دەورو پشـتی رەوانـدز بـون ، دوای ئەمە کومەلی نەتـەوە بـریاری دا کـە شـورشەکەیان پـەرە پی بسـینن‌و فـراوانی بکەن لـە قەلای « باتاسـ » ئینگلـیزەکان « ٦٠ » سـوارەی سـەربازیان هەبو ئەمانـە هەمـو کـورد بـون لـە ژیـر فەرماندەی ئەفسـەریکی کوردا بـون ، ئەمانـە چـاو دیـری کـردنی ناوچـەی حریـریان پـی سـپیرابو چـەند روژیـك لـەوە پیشـ ئـەم ئەفسـەرە پیـاویکی نـاوداری کوشتبو ـە ناوچـەیەدا ، دانیشـتوانی ئـەم ناوچەیـە زوریـان لـی‌یان پـر بوون‌و دلگـیر بون ، لـە بـەر ئـەوە لـە ژیـر فەرمانـدەی جـواد ئاغـاو خدر ئاغـادا دوو سـەد چەکـدار لـە هیـری نەتـەوە لـە گـەل ئەفسـەریکی تـورك‌و « ٢٠ » سـەربازی تورکـا لـە بـەری بەیـانا هـیرشیان بـردە سـەر هیـزەکەی « باتـاس » وە ئابلووقـەی قـەلای « باتـاس »یـان دا بـی تەقـەو بەرگـری هەمـویان گرتـن‌و ولاغ‌و چەکەکانیـان لی سەندن تەنیـا سـواریکیان نەبیـت لـە ریگـای شەقلاوەوە رای کرد ئەفسەرەکەش کوژرا ، سـەربازە دیلـەکان بـران بـو رەوانـدز لـە بـەر ئـەوەی کورد بـون هەمـو لـەوی بـەردران ، هیـزی نـەتەوە تالانیکی باشـیان دەست کەوت ، شـیخ رەقیب کـرا بـە حاکمی حەریـر ، مـیرانی قـادر بـەگ لە شـەقلاوەوە بـە شیوەیەکی نهینـی نامەی بو ناردن وە پەیوەندی دوستایەتی لـە گـەل پەیدا کردن ، وە میرانـی ئەحمـەد بەگی « بیتـواتە » لـە گـەل مـیرانی رەشـید بـەگی کوریـدا هاتـن بو رەوانـدز بو دیـدەنی کومەلی نەتـەوە حاجـی رسـول ئاغـای شـاور داوای دیـدەنی غفـور خانـی کرد

قالـەی ئایشــە خـانو ماجـد مصــطفی لــە ریگــای ئــیرانەوە هاتنـــە رەوانــدز ، ماجـد بــە دزیەوە بە ئەحمـــەد تەقــی ووت : ــ « توفیـــق وەهبــی »و « ســەمەر ڤیــل » هاتنــە ســولەیمانــی بــو دامــەزراندنــی بــەرپوەبەرایەتیــەکی کوردایــەتی بــی شــیخ مەحمــود ، لــە بــەر ئەوەی کــە زوربــەی دانیشــتوانی شــاری ســولەیمانــی لایــەنگری هاتنــەوەی شــیخ مەحمــود ئەکــەن ، ئــەم ئیشــە ســەری نەگــرتو دوا خــرا ، پاشی ماوەیــەك کومــەلی نەتــەوە چــون بــو ناوچــەی شــاوور لەوی دانیشتوانی ناوچــەی « ئاکــو » هــیرشیان بــردە ســەر شــاری رانیـــە ، کومەلــی نەتەوەشــی چــون بــو یاریــدە دانو لــەم شــەرەدا بەشــدار بون ، حاکمی سیــاسی دەربەنــد لــە گــەل بابکـر ئاغــای سـلیم ئاغـا بــە هیــزیکی گــەورەوە هاتبــوە قەلای رانیــەو بــەرگریان دەکــرد ، هیــزی نەتــەوە لە هەمــو لایــەکەوە هــیرشیان بــردە ســەر رانیــەو ئابلــووقەی شارەکەیان دا ، شــەر بــە تــونــدی دەســـتی پــی کــرد ، « ماجـد مصطفـــی » ئوتوماتیکیـکــی وەرگــرت هەتــا ســەرچاوەی قوولــەی رانیــە هیرشــی بــرد ، ئوتوماتیکەکــەی تیکــچو ئەوەنــدەی نەمابو تیــا بچــی زور بــە زەحمــەت رزگــاری بــو ، پاشــی بەرگــریەکی زوری بــی ئەنجـام حاکمی ســیاسیو بابکــر ئاغــا رانیــەیان بــە جی هیشــتو هیــزی نەتەوە گەرانەوە حاکمــی سیاســی وە بابکــر ئاغــا بــە ســوپاوە رویــان کــردە شــاوور دانیشــتوانی ناوچەکــە هەمــو چــوبون بو نــاو شــاخەکان لــە بــەر ئەوە پاشــی یەکــدو روژ گــەرانەوە بــو رانیــە ، لــە رەوانــدز قالــەی ئایشە خـانو وە ماجـد مصطفــی نامەیەکیــان لــە ئەحمــەد تەقــی وەرگــرت بو

والـی « وان » وه گـەرانـەوه بـو « وان » لەویشـەوه چـون بـو لای ئیسماعیـل ئاغـای سمکـو لـە دوای دیـدەنیو گفـتو گـو له ریگای پشـدەرەوه گەرانـەوه بـو شـاری سـولەیمانی مەفرەزەی تـورك توپیکی تـری بو هـات لـە گـەل سـەد سـەربازی تـرا و محـیالدیـن بـەگ کـرایەوه بـە فەرمانـدەر •

ئینگلیـزەکان تـا ئـەم کاتـە هیـچ جـوره دەسـەلانیکیان نەبو له نـاوچەی رەوانـدزو حەریـردا وه هـەر وەهـا لـە ناوچەکانـی شـاوورو رانیـەو سـندولانو قەلادزەشـا وه لـە هەمـو ناوچەکانـی تـری دەورو پشـتا ، ئینگلیـزەکان چـوار سـەد سـەربازی نەسـتوریو ئاثـوورییان لـە عەقـرەوه هینـایە سـەر زیـی بادینـان واتـە زابـی گـەوره وه « ١٥٠٠ » سـەربازی لیـویان هینـا بو شـەقلاوه ، شـیخ رەقیـب حاکمی حەریـر راپوریکی لـەم روەوه دا بـە کومەلـی نـەتەوەو ئاگـاداری کـردن کـە ئـەم هیـزه ئامادە کـراوه که لـە دوو قولـەوه هـیرش بینـن بـو سـەر « باتاسـو حەریـر » هیـزی نەتەوەشـ بەرامبـەر بـەم ئاگادار کـردنه ، هیـزی باتاسـو حەریـری زور بـە هیـز کـرد بو بـەرگـری کـردن بەرامبـەر بە هیرشـی دوو قولـی ئینگلیـز ، هیـزی ئینگلیـز لـە دوو قولـەوه رویـان کـردە باتاسـو حـەریر وه فـروکەکانیان له ئاسمانەوه پاریـزگاری دەکـردن ، تەقـە لـە نـزیك باتاسـ دەست پـی کـرا هـەردوو هیـزەکەی ئینگلـیز گەیشـتن ، بو بـە شـەریکی خوینـین فـروکەکانیان حەشـریان دەکـردو باشـ هەلـدەسوران ، پاشـ نیـوەرو هیـزی ئینگلیـز لـە بـەر باتاسـا ناچـار کـران بـە کشـانەوه له گـەل

هیـ زی تـریانا بونـه یـەك وە یەكسـەر  هەردو لایـان هـیرشیان بـردە سـەر حەریـر ، نیـوەی حەریـریان داگـیر كـرد هیـزی نەتـەوە ناچـار بـون لـە لای سـپیلكەوە دەسـتیان كـرد بە تـەقاندنـی تـوپ بـەرەو دەشـتی باتاسـ بـو ئـەوەی هیـزی ئینگلیـز بشـلەزینـن ، لـە بـەری یەیانـا هەمـو هیـزی نەتـەوە لـە هەمـو لایـەكەوە هـیرشیـان بـردە سـەر هیـزی ئینگلیـز ، لـە گـەل ئـەم هـیرشـەدا هـیزی ئینگلیـز دەسـتیان كـرد بـە كشـانەوە بـو ریگـای « بالیسـان » و « شەقلاوە » هیـزی نـەتـەوە تا نـزیك بالیسـان دوایـان كەوتـن‌و زیانیكـی زوریان لـی دان لـەم شـەرەدا شـیخ جـواد وە خـدر ئاغـای حـەمـەدە شـن زور دلـیریان نـواندو ناویـان دەركـرد •

## ✻هاتنی ئوزدەمـیرو هیزەكەی بو رەوانـدز :ـ

لـەم كاتـەدا بو حكومەتـی فەرەنسـە لـە گـەل توركیـادا ریـك كـەوت « ئـەدەنە »ی دایـەوە بـە توركیا « ئوزدەمـیر » كـە لـەوی شـەری دەكـرد لـە گـەل فەرەنسـیەكانا لـەویوە بـە خـوی‌و هیزەكەیەوە ناردیـان بو رەوانـدز بـەم جـورە هیـزی رەوانـدز بەهیـز كـرا •

« ئوزدەمـیر » نـاوی خـوی « علـی شـفیق »ە رەگـەزی چەركەسە

پیاویکی وریا بوه ، له پشدر ئەو ئاغایانەی له دژ بابکر ئاغاو
رژیمی حوکمی ئینگلیز بون خویان ئاشکرا کرد هەمو بە مالەوە هاتنبە
« وەزنە » بو ئەوەی نزیك بن له جولانەوەی رەواندز نوینەریان
نارد بو لای ئوزدەمیر ، داوایان کرد کە هیرش ببریت بو سەر
دەربەند ، هەر وەها لەم داواکردنەدا پشدەریەکانو رانیەییو
غفور خان بە توندی هەولیان داو داوایان لە « ئوزدەمیر » کرد
کە هیرش ببەرنە سەر دەربەند ، شیخانی بجیل داوایان لی کرد
هیرش ببرینە سەر عەقرە ، لەم وەختەدا « کەریم بەگی فەتاح
بەگی » هەمەوەند وە « فەقی محمد »و « سید محمد جەباری » له
گەل دوو سەد سوارا له ریگای حەریرەوە هاتنە رەواندز ، ئەم
هاتنەی ئەمان زور دەنگی دایەوە ، پاشی یەکدو روژ لە دوو قولەوە
هیرش برا له شاوورو ناو دەشتەوە ، ئەحمەد تەقی لە قولی
شاوورەوە له گەل هەمەوەندکان بو بە بی ئەر گیرا ،
« ئوزدەمیر » لە قولی ناودەشت بو لە گەل « بەهلول ئاغا »
مدیری ئینگلیزەکاندا بە شەر هاتن ، نزیکەی سەد چەکداریکی
شیخی سەلان لە گەل ئەحمەد تەقی‌دا چون بە دەنگیانەوە هیزی
بەهلول ئاغا شکاو هیزی نەتەوە بە ئاسانی چونە « شەهیدان »
کە دوو سەعا تلە دەربەندەوە دورە هیزی لای شاوریش رانیەیان
داگیر کرد ، ئینگلیزەکانیش لە ژیر فەرماندەی « میجەر ئەدمونلسن »
دا هیزیکی گەورەیان لە دەربەند کوکردبووە بو بەرگری ، بابکر
ئاغاش له قەلادزە خوی قایم کردبو ، خەتی تەلەفونی بەینو

قەلادزەو دەربەند بررابو ، هەردوو لوتکەی چیاکان هیزی نەتەوە
داگیری کردبو ، هیزی نەتەوەی دەست وەشین لە شەهیدان
ئامادە بون بو هیرش بردن ، ئینگلیزەکان بریاری ئەوەیان دا کە
واز لە دەربەند بینن و بگەرینەوە ، هیزی نەتەوە لە بەری بەیان
هیرشی بردە سەر دەربەند ، لە بەر ئەوەی کە هیزی ئینگلیزی
تیا نەمابو بی شەر گیرا ، هیزی نەتەوە رویان کردە « بوسکین »
بە دوای هیزی ئینگلیزدا کە هیشتا لە قەلای بوسکیندا مابون ،
دەست کرا بە شەر کردن بە توپ و مەترەلیوز ، هیزی نەتەوە
لە هەمو لایەکەوە هیرشی برد ، هیزی ئینگلیز شکاو رویان
کردە شاخی « دەرو بزماری » بەرامبەر رانیە کە لەوی خویان
بگرنەوە ، سوارەی هیزی نەتەوە لە پیش ئەواندا سەر شاخەکەیان
گرت هیزی ئینگلیز کە بەمەیان زانی گەرانەوە بو لای گردە
« بلویرەکە » کە لەویدا خویان بگرنەوە ، لە بەری مەرگەوە
سوارەی پشدەری لە پیش گەیشتنی ئەواندا گردەکەیان گرت ،
ئیتر هیزەکەی ئینگلیز هەمو بە پەریشانی کەوتنە ناو مەرەزەکانی
دەشتایی « بتوین »ەوە توپ و گرانایی و زور شتیان لی بەجی ما ،
لە م کاتەدا فروکەی زوری ئینگلیز هات وە فریای هیزە پەرشو
بلاوو بەزیوەکە کەوت لە ژیر پاریزگاری فروکەکانا بە پەلە
پروزکی خویان گەیاندە « سەرخمە » وە چونە « کویسنجاق » بو
سبەینی ئەویشیان بە جی هیشت ئنجا سولەیمانیشیان چول کرد .
وە بریاری هینانەوەی شیخ مەحمودیان دا لە دیلی •

نوینەرانی شاری کویسنجاق هاتن بو رەواندز بو لای کومەلە داوای ناردنی مەفرەزەیەکی « ٥٠ » سەربازیان کرد کە بنیریت بو « کویسنجاق » ، کومەلە بریاری ناردنی مەفرەزەی « ٥٠ » سەربازی دا لە گەل ئەفسەریکی تورکدا کە بچن لە گەل نوینەرانی کویسنجاقدا ، مەفرەزە چو بو کویسنجاق ئینگلیزەکان بەمەیان زانی لە هەولیرەوە فروکەیان نارد شاری کویەیان بومبا بارانیکی توند کرد ، دانیشتوانی شاری کویە هەمو بە جاریك هەلسانە سەر پیو نارەزایی خویان پیشاندا بەرامبەر بە چوونی ئەو مەفرەزەیە بو « کویسنجاق » « ١ » ، وە بە کردەوە مەفرەزەکەیان دەرکرد ، ئەم مەفرەزەیە نیررا بو « خدران » • ئینجا لە سولەیمانییەوە نوینەران هاتن داوای هیزیان کرد کە بنیریت بو سولەیمانی بو داگیر کردنی ، کومەلی نەتەوە لە وەلاما بە نوینەرانی سولەیمانیان ووت « ئیستا لەم کاتەدا ناردنی هیز بو سولەیمانی وە داگیر کردنی زیانی هەیە بو گیرانەوەی شیخ مەحمود بو سولەیمانی ، وە هەروەها زیانی هەیە بو بابەتی جولانەوەی بابەتی نەتەوایەتی لە سولەیمانیدا » • چونکە ئینگلیز ئیستا سولەیمانی بەجی هیشتووە

---

« ١ » وا دەردەکەوی نوینەرانی کویسنجاق چل خوارەکانی کویە بون لە خوینالە ە هاتبون بە ناوی دانیشتوانی کویەوە داوای ناردنی مەفرەزەی تورکیان کرد ، زوربەی دانیشتوانی کویە قایل نەبون بە هاتنی ئەم مەفرەزە پەراگەندە برسیە ، بویە دەریان کردن •

ـ نووسەر ـ

بـریاری هینانەوەی شیخ مەحمــودی داوە ، ئەگــەر هیــزی کومەلی نەتەوە، ـکە مانــای « هیــزی تــورك »ە بیتــە ســولەیمانی ، ئینگلیــزەکان ئەمــە دەکــەن بــە بەهــانە بە دەســتیانەوە بــو تەگــەرە دان لە هاتنــەوەی شیــخ مەحمــود وە شــارەکەش بــە بومبــا ویــران دەکــەن وە دایــدە بیــژن ، ئەمــە ئــەو وەختــە زیــانیشــ دەبەخشــی بــە ئیمــــە ، نوینــەرانــی سـولەیمانی لــە وەلامــی کومەلــەی نــەتەوە دلگــیر بــون وە رەخنــەی زوریــان لــە ئەحمــەد تەقــی گــرت کــە گویــا ئــەو بــوە بــە هــوی ئــەوەی « ئوزدەمــیر » هیــز نانــیریت بو ســولەیمانی لە ســەر داوا کردنی جـل خــوارەکانی ســولەیمــانی •

مەفــرەزەکەی « خــدران »و « پشــدەر » نــیران بــو دەورو پشتی ئەشــکەوتەکانــی « قەمچوغە » لــە ســورداشــ کــە شــیخ مەحمـــود گــەرایەوە بــو ســولەیمانی ئــەو مەفــرەزەیە لــە قەمچــوغەوە گەرایــەوە بــو رانیــە ، بابکــر ئاغــاش بــە بــی شــەر قــەلادزەی دایــە دەســت عباســ ئاغــا ، خوشــی چو بو کویســتان ئنجــا لە قــەزای رانیــەو پشدەرا تشــکیلاتی ئیــداری بو بە بەریــوەبەری کــارو بــار بــەم جورەی خوارەوە کــــرا : ــ

بــایز ئاغــای عباســ ئاغــا کــرا بە قائمقامــی قەلادزە ، قــادر ئاغای مصطفــــی ئاغــا وە مدیــری مەرگــە ، شــیخ ئەمینــی ســندولان بــوە قائمقامی رانیــە ، غفــور خــان بــوە مــدیری نــاو دەشت ، مەفرەزەیەکیش نــیررا بــو دەربــەند ، « فــەوزی بــەگ »نــاو کــە تــورك بو کــرا بــە

سەرکردەی هەردوو قەزاکە وە ئەحمەد تەقی کرا بە مفتشی ئیداری، بارەگاشی لە رانیە بو ، هێزی تورك لە گەل « ئوزدەمیر »دا گەرانەوە بو رەواندز وە هێزەکانی تریشی بلاوەیان لی کرد ، فروکەی ئینگلیز بە توندی دەسورانەوە بە سەر رانیەدا .

پاش گەرانەوەی شیخ مەحمود بابکر ئاغاو عباس ئاغا پیکەوە ئاشت بونەوەو بە جوتە چون بو سولەیمانی بو بەخیر هاتنەوە کردن لە شیخ مەحمود ، کە گەرانەوە لە رانیە عباس ئاغا ووتی « مستر چەپمەن »م دیوە داوای کردوە کە تورکەکان دەرکەین ، ئەویشی لە وەلاما وتویەتی بی معنایی حاکمە سیاسیەکانی ئینگلیز بوە هوی هینانەوەی تورك ، ئەگەر ئەوان باشبن دەریان ئەکەین ، « چەپمەن » وتویەتی « کارو باری سولەیمانی درایە دەست شیخ مەحمود ئەویش خوی ئەزانی چی ئەکا » ، عباس ئاغا وتویەتی « کە دەگەرینەوە کاریکی وا دەکەین کە تورکەکان قەلادزەو رانیە بو شیخ مەحمود بەجی بیلن ، وە ئیوەش کاریکی وا بکەن « کویسنجاق » بدریت بە شیخ مەحمود » ئەحمەد تەقی بە فەرماندەری تورکی ووت بو گەرانەوەی هەمو هیزەکانی تورك لە قەلادزەو رانیە بو رەواندز ، پاش سی روژی تر « ئوزدەمیر » فەرمانی دا بە گەرانەوەی هیزەکانی تورك هەمو بو رەواندز ، ئنجا شیخ مەحمود ئاگادار کرا کە نوینەرانی خوی بنیریت بو قائممقامیو بەریوەبەری کارو بار ، کاربەدەستانی شیخ مەحمود گەیشتنە رانیە ئالای کوردستانیان

هەلکـرد ، ئینگلیـزەکان کوسـنجاق‌یـان نـەدا بـە شـیخ مەحمـود وە کەوتنـە بـلاو کـردنەوەی پـرو پاگـەندەو فـرو فیـل کـردن ، ئینگلیـز خـواهەکان بە تونـدی لایەنگـری ئینگلیـزیان دەکـرد ، تـورك خواهەکان لایـەنگری تورکیـان دەکـرد ، بەدبەختـی کـورد سـەری لـە هەمـوان شـیواندبو و ەلـە سـیاسەتیشا هەمـو کولـی سـوار بونو قـال نەبـون شـیخ مەحمـودی بەسـزمان لـە نـاو ئـەم چـەند تەیـارە سیاسـیـەدا سـەر سـام وەسـتابو ، دلیشـی لـە ئینگلیـزەکان زور رەنجـابو باوری پی‌یـان نەمابـو ، لـە بـەر ئـەوە لـە ژیـرەوە ، مخابـەرەی لـە گـەل « ئـوزدەمیر »دا دەکـرد وە داوای یـاریدەی لـی کـرد ، ئەویشـس بـە ئاشـکرا وەلامی دایـەوە کـە ئـەم یاریـدەدانە لـە دسـەلاتی ئـەودا نیە ئەبـی ئەویشـس ئـەم باسـە بگـەیەنیت بـە ئەنقەرە ، ئـەم ئیشە زور دورو دریـژی کیشـا لـە بـەر ئـەوە شـیخ مەحمـود لەمەشـس وەرسـس بـو بـە تونـدی داوای نـادنـی نوینـەرانی « ئوزدەمـیر »ی کـرد بـین بـو لای خـوی بـو دیـدەنی‌و گفـتو گـو کـردن ، « ئوزدەمـیر » ناچـار بـو یوزباشی « رائـد » « فـوزی بـەگ »و قائممقامـی پیشـو رەمـزی بـەگو ئەحمـەد تەقـی بـە نوینـەرانی خـو ی‌نـارد بـو لای ، شـیخ مەحمـود لە سـولەیمانی وە ئاموژگـاری کـردن کـە بـە شـیخ مەحمـود بلـین « مەفـرەزەی رەوانـدز بـیرو بـاوریکی باشـی هەیـە بەرامبەر بـە کوردسـتانی خـوارو » ٠ بە تایبـەتی بەرامبـەر بـە شـیخ مەحمـود ، وە حـەز بە هەمـو جورە ریـوەبەریەك ئەکـا کـە پیـك بیـت لـە بەینـی تورك‌و کوردسـتانی خـواروداا ، بـەلام هەمـو شـتیك کـە بکـریت ئەبی

لە سەر بریاری حکومەتی مەرکەزی تورك بکریت لە ئەنقەرە •

نوینەرانی « ئوزدەمیر » بە شیوەیەکی نهینی چونە شاری سولەیمانی لە مالی شیخ مەحمود میوان بون ، بەلام لە پیش ئەوەدا ئەوان بگەن ئینگلیزەکان زانیان ، لە کاتی گفتو گودا ئەحمەد تەقی بە شیخ مەحمودی ووت « قوربان پەلەتان کرد لەم روژەدا داوای سەر بەخوی‌و سەربەستی لە تورك کردن زور بی جی‌یە چونکە تورك لەو دەسەلات‌و توانایەدا نیە کە ئیوە چاوەریی ئەکەن •

نوینەرانی ئوزدەمیرو شیخ مەحمود پاش گفتو گو کردن بریاریان دا کە شیخ مەحمود نوینەرانی خوی بنیریت بو ئەنقەرە بو گفتو گو کردن لە بارەی « خود مختاری »یەوە « حکمی زاتی » لە کوردستانی خوارودا بە سەروکایەتی شیخ مەحمود لەو کاتەدا « فتاح بەگی ئەمینی عەتار » ژن برای شیخ مەحمود بە نوینەری « حسین روف » سەروك وەزیرانی تورکیاوە هات بو لای شیخ مەحمود ، شیخ مەحمودیش نوینەرانی خوی ئامادە کرد بو ناردنی بو ئەنقەرە ، ئەوانیش « فتاح بەگی ژن برای »وە « رەفیق حلمی بەگ » وە « ئەحمەد تەقی » ئەم سیانە پیکەوە هەرسیکیان چون بو رەواندز لەوی کارو باریان لە « ئوزدەمیر » گەیاند ئەویش نوینەری خوی یوزباشی فەوزی بەگی لە گەلا ناردن ، بار لە رەواندزا باش نەبو چونکە کردەوەکانی «ئوزدەمیر » زور ناشیرین بو ، هەندی پیاو خراپی لە دەورو پشتی خوی

کـو کـردبووه خـراپەیان پـی دەکـرد وەك « نەورەسـ ئەفەنـدیو علی ئاغـای جنـدیانو شـیخ محمـد ئاغـای وەلاشـ » ئەمانـە هەمـو سەر بە ئینگلیـز بـون ، ئەمانـە لـە گـەل نوری یاویـل ئاغـاو شـیخ رەقیب دا تیـك چوبـون •

لـە بـەر ئـەوەی کـە ریگـای شـەمدینان بەفـر گـرتبوی هـەر چـوار نوینـەرەکە لـە ریگـای ئـیرانەوە چـون بـو « تـەوریز » لەوی لـە کونسـولخانـەی تـورك میـوان بـون ، لـەو کاتـەشـا روسیـای شـیوعی بەینـی لـە گـەل تورکیـادا زور باشـ بو لـە بـەر ئەوە ریگایان دا بـەم چـوار نوینـەرە کە لـە ریگـای « باتـوم »و « یەریڤان »ەوە بچن بو تورکیـا ، لـەو ی:یـدەنی کاربەدەسـتانی تورکیـایان کـرد لـە هەمـو گفـتو گوکـاندا کاربەدەسـتانی تورکیـا هـەرگیـز باسـی « خـود موختـاری » حکمی زاتـی کوردسـتانی خـوارویان نەکـردوەو خـویـان نەداوە لـە قـەرەی ، هەمـو باسـەکانیان هاتبـوە سـەر ئـەوەی کە لوایەك سـەربازی تـورك بنـیرن بـو رەوانـدز ، بـەلام ئینگلیـزەکان بـەم بـریارەی تورکیان زانـی لـە بـەر ئـەوە ئـەوان بـە گورجـی دەسـت پیشـکەری خویـان کـردو هیـزیکی گەورەیان نـارد بـو رەوانـدز ، « ئوزدەمـیر » بـە هیـزە پـەراگەندە شـەقو شـرەکەیەوە رای کـرد چو بـە دیـوی ئـیراندا ، سـید طـە هـیرشی بـردە سـەر « نەهـری » لوای تـورك لـەم کاتـەدا گەیشـتە « باشـقەلا » کـە بـەم هیرشەی « سـید طـە »یـان زانـی ئەوانیشـ هیرشیـان بـردە سـەر « نەهـری » سوپای سـید طـە شکـا ، رفیـق حلمـی بـەگ کـە زانـی تورکەکـان نیازیان

باشــى نيــه بەرامبــەر كوردەكان بــه دل تەنگــى لــه ريگــاى ديار بەكرەوە گــەرايەوە بــو ســولەيمانى ، لــەو كاتــەدا « عصــمت ئينــونــو » لــه « لــوزان » بو بــو دوان لــه بابــەت ولايــەتى موصــلەوە ئينگليــزەكان لــه « لــوزان » ئــەو مەزبەتانەيان كــردبو بــه بەلگــه بــه دەســتيانەوە پيشــانى كونگــەرەيان ئــەدا كــه لــه ســولەيمانى مــور كــرابــون لــه بابــەت حكمــرانى شــيخ مەحمــودەوە وتبــويان ئــەم مەزبەتانــه شاهدنو بەلگــەن بــو ئــەوەى كــه ئيمــه راســت ئەكــەين كــه دەلــين كوردەكان خويــان هاتــون بــه شــوين ئيــمەداو بــردويانــين بــو ســولەيمانــىو توركەكانيــان دەركــردوە ، •

باشــى تەواو بونــى بابــەتى لــوزانو ســەركەوتنــى تــورك لــەو پــەيمانەدا ، توركەكــان بــرياريــان دا كــه بــه كــارو بــارى سياســى بابــەتى موصــل بيــرينەوە ، له بــەر ئــەوە « فتــاح بەگــى ژن بــراى شــيخ مەحمــود » گــەرايەوە بو ســولەيمانى بــو ئــەوەى لاى شــيخەوە مەزبەتە بــەريت بــو ئــەوەى ببــى بــه نوينــەرى شــيخ مەحمــود بــه نــاوى ولايەتــى موصــلەوە ببى بــه ئەنــدام لــه پــەرلەمانى توركيــادا ، ئەحمــەد تەقيشــى گــەرايــەوە بو ســولەيمانى بو ئەوەى ئەويشــى مەزبەتە بــەريت ببــى بــه ئەنــدام لــه پەرلەمانى توركيادا به ناوى ولايەتى موصلەوە

## ئەحمەد تقی‌و ئیسماعیل خانی سمکو :ـ

ئەحمەد تەقی کە چو بو دیدەنی ئیسماعیل خانی سمکو لی‌ی پرسی بوچی لە گەل ئینگلیز ریك ناكەوی ؟

ئیسماعیل خان لە وەلاما ووتی :ـ ئینگلیزەكان‌و توركەكان هەردوو لایان درومان لە گەل دەكەن لە با بەت سەربەخویی‌و سەربەستی كوردستانەوە ، هەر بەلین‌و قسەیەك بدەن‌و بلین درو دەكەن وە هەلمان دەخەلەتینن ، ئینگلیز ئەیەویت هەمو كوردیك وەك نوكەر هەلسورینی‌و ئیشی پی بكات بو چاكەو دەست كەوتی خوی ، وەك مەیمون هەلمان پەرینی بو كەیفی خوی بەرامبەر نەتەوەكەمان شەرمەزارمان بكا ئەمەش بە من ناكریت ، وە هەر وەها ووتی « لە كاتیكا من لە شوینەكەی خوم رامكردو توركەكان هیرشیان هینایە سەرم لە سەر ئاموژگاری‌و هاندانی سید طە ، من هاتم بو ناوچەی « دیری » لە عیراق لە لوای هەولیر بو دیدەنی‌وریك كەوتن لە گەل ئینگلیزەكان . حاكمی سیاسی ئینگلیز لە گەل سید طەدا هاتنە « دیری » بو دیدەنیم دورو دریژ قسەمان كرد پیم ووت « من كوردم‌و لیم قەوماوە دوژمنی حكومەتی « فارس »م لە ئیران ، ئەوا ئەمجارەش بومە دوژمنی تورك چونكە ژنیان كوشتم‌و كوریان بە دیل بردم ئیوەش ئینگلیزەكان گەلی قسەتان كردوە لە گەل « كومەلی

کورد » لە ئەستەمول وە بەلینی زورتان داونەتی هیچتان بە جی نەهیناوە ، لە بەر ئەوە کوردەکان لە گەل مصطفی کمالدا ریك کەوتن ، وە هەر وەها لە کوردستانی خواروشدا ئیوە ئیدارەی حکومەتی شیخ مەحمودتان تیکدا ، ئەوانیش ناچار بون لە گەل کمالیەکانا ریك کەوتن وە هینایانن بو « رەواندز » لە کوردستانی خواروداً ، ئیستاش من لە جیاتی هەمو کوردیك لە هەمو کوردستاندا پیتان ئەلیم ، ئەگەر ئیوە ئامادە بن و راست بکەن وە بە راستی بینە پیشەوە بو دانی سەربەخوی بە کوردستان ، منیش خوم ئامادەم وە بەلین ئەدەم کوردتان لە گەل ریك بخەم ، ئەگەر ئەمەش ناکەن ، تەنها داواتان لی ئەکەم یاریدەم بدەن بچمەوە جیگای خوم ئایا بە شەر کردن لە گەل ئیراندا وە ئایا بە ئاشت بونەوە لە سەر بەلین و گفتی ئیوە ، •

حاکمی سیاسی ئینگلیز لە وەلاما ووتی : —

جاری حەز ئەکەم بزانم ئیوە کوچتان کردوە چەند پارەتان پی ویستە بو نەهیشتنی ئاتاجیتان ؟

ئیسماعیل خان وەلامی دایەوە ووتی : هیچ جورە ئاتاجیەکمان نیە ، من میوانی برا کوردە دلیرەکانم تازە شیخ مەحمودی بەریز « ٥٠٠ » لیرەی ئالتونی بو ناردوم •

حاكمی سیاسی ئنجا ووتی : ئەی چونە لاتان كە سید طه بكەین بە حاكمی رەواندزو حەریر ، وە ئەحمەد ئاغای برات بە حاكمی بادینان ؟ .

ئیسماعیل خان لەم پرسیارەی حاكمی سیاسی زور دلگیر بو ووتی : « منو سید طه كوچەرین لە « دیری » دانیشتوین ئەم ناوچەیە لە شورشان لەگەل ئیوەدا ، من نە پیشەوە بوم روون كردنەوە ئەگەر راست ئەكەن نەبی لە پیش هەمو شتیكەوە سەربەخویی‌و ئازادی كوردستان بخەنە بەر چاو تەشكیلات‌و دانانی خەلك ئەبی بە پیی ئارەزوی دانیشتوانی ولاتەكە بیت نەك ئارەزوی منو تو ، لام وایە ئیوە نیازتان وایە بە قبول كردنی ئەم داوا كردنانە .

بیمە بكەن بە دوژمنی كوردەكانی كوردستانی خوارو وە سوكمان بكەن لە ناویانا ، بو لە بریتی پرسیی‌دانانی حاكم بو رەواندزو حەریر ، باسی تەرتیبات‌و تەشكیلاتی دامەزراندنی سەربەخوی یی كوردستان نەكەن ؟ وە بە نوینەر نامنیرن بو لای شیخ مەحمود كە بەشدار بیی لەم یەكیەتیەدا ؟ بەداخەوە زور بە ئەندیشەوە ئەلیم داواكردنەكانت لە جیی خویا نیە ! .

حاكمی سیاسی پاش بی دەنگ بوون‌و بیر لی كردنەوە بو ماوەیەك ووتی « ئەم داوا كردنانەی ئیوە بە من نە دەگیریتەوە وە نە قبولیش دەكریت چونكە لە دەسەلاتی مندا نین » .

فەرمو با بچین بو هەولیر لەویوە نوینەری سامی لە بەغداوە دەهینن بو گفتو گو کردنو دوان لەم بابەتە ، لە سەر ئەم بریارە حاکمی سیاسیو سید طەو ئیسماعیل خانی سمکو سواری ئوتومو بیلەکەی حاکمی سیاسی بون ، ئیسماعیل خان بە سوارەکانی خوی ووت بە غار دوایان کەون ، رویشتن لە ریگا ئیسماعیل خان گویی لیبو حاکمی سیاسی بە روسی هەندی قسەی لە گەل سید طەدا کرد لە دژ ئیسماعیل خان بوی دەرکەوت کە بیرو باوری خراپە دەربارەی وە نیازی وایە کە گەیشتنە هەولیر لەوی بیگریتو دووری خاتەوە ، سید طە بە حاکمی سیاسی ووت ئیسماعیل خان روسی دەزانی ووسبە ئیتر ئیسماعیل خان باوری پییان نەما بە گورجی بە شوفیرەکەی ووت بوەستە ؟ حاکم ووتی رامەوەستە لی خورە ، ئیسماعیل خان لەم قسەیە زیاتر کەوتە شکەوە ، دەمانچەی هەلکیشاو لولەکەی خستە سەر پشتی شوفیرەکە ووتی ئەگەر رانەوەستی ئەتکوژم شوفیرەکە لە ترسانا وەستا ، ئیسماعیل خان لە ئوتوموبیلەکە هاتە خوارەوە ، جنیویکی زوری دا بە سید طە ؛ بە حاکمی سیاسی ووت ئیوە لە گەل سید طە بچن بو هەولیر ، منیش لە ریگای شەقلاوەوە ئەچم بو سولەیمانی تا هەول بدەین بو پیك هینانی پیویست خو ئەگەر قایلیش نەبون یاخوا خوای ئەم کوردە باشە ئازاو دلیرە بتان گری !

لـه یـهك جیـا بونهوه ئـهوان بـو ههولـیر ئیسـماعیل خانیشـس بـو سـولهیمانی بو لای شیخ مهحمود .

## ئینگلیزهكانو حكومهتی ئهرمهنی :ـ

لـهم كاتـهدا بـو ئینگلیـزهكـان لـه پیشـس ئـهوهدا بچنـه ئهسـتهمولهوه لـه كوردسـتانی ژورودا بـهلینـان دابـو بـه ئهرمهنیهكان بـو دامهزرانـدنی حكـومهتیكی ئهرمـهنی گـهورهو فـراوان لـه ولاتی كوردسـتانی ژورودا ، بویـه كوردهكان زور داخ لـه دل بـون له ئینگلیزهكان وایـان لـی هاتبـو « شـهیتان » دهسـتی یـاریدهو یارمـهتی بـو دریـژ بكـردنایه دهسـتیان دهگـرتو لـه گهلـی ئهبـون لـهم كاتـهدا مصطفی كمـال كـه مفتشـی ئـوردو بـو وه جـی بـاوریخهلـیفـه بـو لـه ئهسـتهمول لـه گـهل چهنـد ئینگلیـزیك هاتنـه « ئهرزوروم »دانیشتوانی ئـهو نـاوهو كوردهكـان یهكیـان گـرت بونـه بـهرهیهك ، واته كوردهكان توركهكـان باشـس تـی گهیشـتن كـه ئهمـه دوا ههنگـاوی مـانو نهمانه پیكـهوه بـه نهینـی كوبـونـهوه ، ئهفسـهرانی هیـزی سـهربـازیو دانیشـتوانـی ناوچـهكانو پیشـهواكـان ههمـو دهسـتیان خسـته نـاو دهسـتی یهكـهوهو بـریاری یاخـی بونیـان دا بـهرامبهر بـه ئهمـرهكانی حكـومهت ، ئهنجـومهنیكیان دامـهزراند بـه سـهروكایهتی مصـطفی كمال

لـەم ئەنجـومەنەدا بـڕیاری بـرایەتی‌و یـەکیەتی« کـوردو تـورك » «١»
درا بـو ئـەو کاتـــەو بـو پاشـە ڕوژ ، ئینگلیـزەکان کـە لـە گـەڵ
مصـطفی کمـال بـوون هەمـوو گـیران لـە یـەکەم کوبـونـەوەدا
« ١٠٠ » هـەزار لـیرەی ئالتـونی پیتـاك کـوکرایـەوە بـو یـارمەتـی
دانـی هیـزی سـەربازی‌و بـەڕیوە بـەرایەتی کـارو بـار •

مصطفـی کمـال بـە ڕەسـمی ئـەم بـڕیارەی بـە بـروسکە گەیاندە
ئەسـتەمول ئنجـا ئینگلیـزەکان « ئەرمەنیـە »کانیـان هانـدا ، هیـزو
سـوپـای گەرمەنـی هـیرشـیان بـردە سـەر ولاتـی « ئـەرزو روم »
هیـزی تـازە یەك گـرتوی کـوردو تـورك لـە گـەڵ هیـزی « کاظـم
قـەرە بەکـر پاشـا » بەرەنگـاری هیـزی ئەرمەنـی بـون‌و شکاندیانن‌و
بـە دوایـانا ڕویشـتن تـا نـزیك سـنوری « ئـەریـوان » کـە پایتەختی
ئەرمەنسـتان بـو چـون وە شـارەکە کەوتـە تەنـگ‌و چەلەمـەی داگـیر
کـردنەوە ، ئنجـا ئەرمەنیـەکان ناچـار شـەرەکەیان وەسـتاند بەو مەرجەی
کـە سـەربازەکانیان هەمـو چـەك بکـرین‌و چەکەکانیـان بـدریت بـە

---

« ١ » کـوردەکـان چەنـد سـاویلکەو دلسـوزن . چەنـد خوشـی بـاورن‌و
بـە قسـەی خوشـی‌و زبانـی لووسـی هەفـرە ئەخـون ، دلسـوزانە لەم کاتـە
پـڕ لـە تەنـگ‌و چەلەمـەیەی تـورکـا بونـە بـرایان‌و یارمەتینان دان . ئـەو
مصـطفی کمـال ئەمـڕوخـوی کـردوتە بـرا لـە گەلیانـا کـە کەوتـە خویشی‌و
پشـتی کـردەوە ، لـە جیاتـی چاکـە لـە تولـەی ئـەو خزمەتـەی کـوردا
دەستی کرد بـە کوشـتنی کوردەکان‌و لـە نـاو بـردنیـان . — نووسەر —

هیـزی تـورك‌و وه مـوتاره‌كه‌ش بـه‌و مه‌رجـه بیـت ئه‌رمه‌نیه‌كـان لـه سـنوری خویـان ده‌رنه‌چـن وه په‌یوه‌نـدیان لـه گـه‌ل ئینگلیـز بیرن وه لـه گـه‌ل روسـیای شـیوعـی‌دا ریـك بكـه‌ون ، مصـطفـی كمـال دیسـانه‌وه ده‌سـتی كورده‌كانـی بـری‌یه‌وه‌و هه‌لـی خه‌له‌تانـدنه‌وه‌و بـه سـه‌ر زاری لـه گـه‌لیان ریـك كه‌وت لـه سـه‌ر بـه‌ریـوه بـه‌ریه‌تـی بـرایانه‌و هاوبه‌شـی پیكـه‌وه بـی جیـاوازی « ئه‌نجومه‌نـی گـه‌وره‌ی نه‌تـه‌وه » پیـك هـات زور لـه كورده‌كـان لـه‌م ئه‌نجـومه‌نه‌دا بـون به ئه‌نـدام ، ولاتـی روژ ئـاوای « ئـه‌نه‌دول »و ولاتـی روژ هه‌لاتی كورده‌كان په‌یوه‌نـدیان بـری لـه گـه‌ل ئه‌سـته‌مول‌دا وه په‌یـوه‌ندیان به‌سـت بـه به‌شـی « ئـه‌نقـه‌ره‌وه » ئینگلیـزه‌كـان لـه گـه‌ل وردی سیاسه‌تیـان هه‌رگیـز بـه یادیانـا نه‌هاتبـو وه نه‌ده‌هـات ئـه‌م كاره‌سـاتانه روو بده‌ن بـه په‌لـه چـون حكومه‌تـی یونانیـان هانـدا بـو هـیرش بـردنه سـه‌ر « ئه‌زمـیر »و ولاتـه‌كانـی تـوركیا ، بـه كـرده‌وه چـون « ئه‌زمـیر »و ده‌وروپشـتیان داگـیر كـرد ، بـه نـاوی خه‌لیفه‌وه حكـومه‌تی ئه‌سته‌مول هیـزی نـارد بـو ئـه‌م شـه‌ره ، پاشـی چه‌نـد شـه‌ریكـی خوینـین سـوپای یونـان شـكاو په‌ریشـان بـو ، « ئزمـیر » سه‌نـدرایه‌وه لـه یونـان ، هیـزی خه‌لیفه‌شـی چونـه نـاو هیـزی مصـطفی كمالـه‌وه هه‌مـو پیـلان‌و فـرو فیلـی ئینگلیـز « ۱ » سـه‌ره‌و ژیـر كـرا ، پاشـی

---

« ۱ » ئینگلیـزه‌كان ئه‌رمه‌نیـه‌كانیان ده‌سـت خـه‌رو كـردو توشـی زیانیان كـردن ، لـه دوای ئـه‌وان یونانیـه‌كـان ، ئـه‌رمه‌نیـه‌كـان‌و یـونانیـه‌كان لـه ئه‌نجاما سه‌ر شور بـون به‌هوی سیاسه‌تی چه‌وتی به‌ریتانیاوه . ـ نووسه‌ر ـ

ئـەوەی ریگـا تەخـت بو بو کمالیـەکانو ئـازاوەو هـەراو مەترسی نەمـا
یـە گورجـی سـیاسەتی خویـان گـوری بەرامبـەر کـوردە دلسـوزەکان
ئـەو بەلینانەی دابـویان بـە کوردەکان لـە هەمـوی پاشـگەز بونەوەو
نەیـان بـردە سـەر ، بـرایەتیو یەکیـەتی بـی جیـاوازیان گـوری بـە
لـە دژ بـونو دوژمنایـەتی ، ئینگلیـزەکانیش ئنجـا بـە جوریکـی تـر
هاتنـە کـورەوەو رەنگیکـی تـریان پوشـی ، سـیاسەتی ئەمجـارەیان
دو سـەری بـو لـە گـەل کـوردو تـورکا ، بـە کوردەکانیان ئـەووت
ئـازادیو سـەربەخویی‌تـان ئەدەینـی وە لـە ئەنجـومەنـی نەتەوەکانـا
مافـی نەتـەوایەتی کـورد دەپاریـزریت ، ئـەوەبو لـەو کاتەشـا لە پاریس
« شـەریف پاشـا » بـوە نوینـەری کـوردەکانو داوای مافـی نەتەوایەتی
کـوردی دەکـرد ، ئەمـە لـە لایـەکەوە لـەلای تریشـەوە میچکە میچکەی
بـو تورکەکـان دەکـردو دلنیایـی دەکـردن بـو ریـك کەوتـن لە گەلیانا
لـە بـەر ئـەوە بـە هیـچ جوریـك کوردەکـان بـاوریان بـە ئینگلیـز
نەمـا وە ئەوەشـی تـی بینـی ئەکـرا کە سـەر لـە نـوی بچیتـەوە بن
کلیشـەی کوردەکانەوەو تورکەکانیـان پـی بترسـینی وە لـە ئەنجاما لـە
سـەر لاشـەی کوردەکـان لـە گـەل تورکـا ریـك کەویـتو کـورد
بیـەردا ، وە هەروەهـا روسەکانیشـن لـە گـەل کوردەکانا هیـچیان نەدەکرد
چونکـە دوسـتی تورکەکـان بـون وە لـە بـەر خاتـری چـاوی کالـی
کـورد وازیـان لـە دوسـتایەتی تـورك نەدەهینـا ، بویـە کـوردی بە
سـزمان لـە هەمو شـت بی بەری بـو وە لـە ناوەراسـتا مایـە پـووچ
مایـەوە ، تەنیـا ئـەوەی بـو مایـەوە کـە هەول ـدا لـە شـەرو بـەلای

ئـەم بـراو دوسـتە کونانـە خوی پپاریزی کـە تـا ئیسـتا هەلیـان خەلەتانـدبو بـە دروو دەلەسـە ، بـەلام گومـرایی‌و بی شـەرمی تورکەکان وە فیـل‌و تەلەکـە سـازی ئینگلیـز بـە هـەر چـوار لادا ئیشـی دەکـرد لـە بـەر ئەوە کـورد لەو بـاوەرەدا نەبـو کـە ئەتـوانی لـەم گـیژی پیـلان‌و سـیاسەتەدا بتـوانی بـی لایـەن بوەسـتی پرشـنگی یەکیـك لـەو دو ئاگرەی بـو نەیەت .

« خالـد بەگی جـیرانی » لـە تورکیاوە بـە تەتەریکـی تایبەتـی خویا لـەم کاتـەدا نامـەبەك‌و شـفرەیەکی تایبـەتی نـارد بـو ئیسـماعیل خانی سـمکو داوای لـی کـردوە کـە کومـەل‌و هیـزی لای خویـان بەهیـر بکـەن ، ئەگـەر بـە باشـیان زانـی خویـان بگەیەنـە روسـەکان یەلکو اقناعیان بکـەن بـو ریـك کەوتـن لە گـەل کوردەکانـا ، لـەو کـاتەدا ئیسـماعیل خانـی سـمکو لـە کونـە دی‌یەکـی ئەرمەنـی بـو لە نزیـك « باشـقەلا » « رشـید جـودت » لـە سـولەیمانیەوە لـە گەلـی هاتبـو و، بـوبوە راوبـیژ کـەری سـەربازی .نەتـەرەکە هـات ، نـامەو شفرەکەی دایـە ، لـەو کاتەشـا ئەحمـەد تەقـی گەیشـت ، ئیسـماعیل خـان بـە ئەحمـەد تەقـی ووت « مـن کـە چـوم بـر « دیـری » لـە عـیراق لـەوی باشـی بـوم دەرکـەوت کـە ئینگلیـزەکان هەلمـان دەخەلەتینن بـەلام چـی بلیـم لـە دەسـت هەنـدی لـە پیـاوە گـەورەکانمان وەك « سـید طەو بابکـر ئاغـاو ئەحمـەد عوسـمان هەولیری »و زوری تریشـی کـە بـاوریان بـە ئینگلیـز قایمـە ، هـەر وەها تـورکەکانیشی لـەوان

خراپتـرن کـه داوای سـەربەخۆیی‌یـان لـی دەکـەن دادەچلەکین ، لـه هەمـو کەسـی زیاتـر کـورد خـوی خـراپه بـو خـوی ؛ فـیری خزمەت کـاری بـوه ، پشـت بـه خـوی نابەسـتی ، بـاوری پـه خـوی نیـه پشـتی یەکتـری ناگـرن ، گـەورەیی یەکتـری قبـول ناکـەن » ووتـی چاوتـان لـی‌یه کـه مـن ئیسـتا لـەم دی‌یـەدا کەوتـوم ، چونکـه وەك جـاران دەسـتم نـاروا ، بـزانن هیـچ کوردیـك مەرحەبـام لـی دەکاو یارمەتیـم ئـەدا • کـوردی ئـەم ناوچەیـە هەمـوو برسـی بـوون ، بە هـوی جـولانـەوەی منەوه لـه ئـیراندا هەمـوو بـوژانـەوه ، ئنجـا بویـه بیگانـەکانو تـورکەکان باشـمان تـی گەیشـتون ، هیـچ گویمان نادەنـی ، دوسـتەکانی دەورو پشـتی شـیخ مەحمـود لایەنگـری ئینگلیز ئەکـەنو لـه دژ شـیخ مەحمـود ئەبـن چونکـه ئەمـرو ئینگلیـز بەهیز دەزانـن ! •

ئیسـماعیـل خـان بـه تـایەتـی ئەحمـەد تەقـی نـارد بـو لای کونسـولی روسـیا له « ئورمـی » دوو راسـپاردەی پیـا نـارد •
یەکەمیـان : ئـەگـەر روسـیا قایـل بیـت ریـك بـکەویـت لـه گەلمـان مـن ئامـادەم هەمـوو کوردەکـانی لـه گەلا ریـك بخـەم بـو یارمەتیـەکی سیاسی‌و دەسـت کـەوتو چاکـەی روسـیا ، بـەو مەرجەی روسـیاش ئـامادە بیـت بـو یـارمەتی دانـی کـوردەکان بـو سـەندنی سـەربەخویـی‌و وەرگرتنـی مافـی نەتەوایەتیمان

دووەمیان : ئەگەر ئەمەشس نەکەن یارمەتی شخصی خوم بدەن بو گەرانەوەم بو شوین‌و جیی خوم لە ئیراندا لە سەر بەلین‌و چاو دیری روسیا • بزانە وەلامیان چی‌یە ؟

ئەحمەد تەقی چو بو « ئورمی »و چو بو دیدەنی کونسولی روسیا ، پاشس دیدەنی‌و گفت‌و گو کردن وەلامی دایەوە ووتی بە ئیسماعیل خان بلین داوا کردنی یەکەمی لە گەل سیاستی ئەمروی روسیادا ناگونجیت وە ناشیانەوی دروی لە گەلدا بکەن چونکە لە پاشە روژدا کوردو روس ئەبی ریك کەون بویە نایانەوی بە دروزن دەرچن لایان ! •

بو داوا کردنی دووەم ئەگونجی تی بکوشین‌و هەول بدەین بام خان لەمەو دوا پەیوەندی بی لە گەلمان ، ووتی ئیوەشس ئەچن بو پشدەر مژدەتان بدەمی ئینگلیزەکان سولەیمانیان چول کرد ، ئیستا شیخ مەحمود لە سولەیمانیە ، ووتی : لە بەر باری دەوڵەتان ئینگلیزەکان سولەیمانیان چول کرد •

ئەحمەد تەقی گەرایەوە بو لای ئیسماعیل خان لەویشەوە چو بو رەواندز وە رانیەو پشدەر مەزبەتەی نوینەری ولایەتی موصلی وەرگرت‌و گەرایەوە بو تورکیاو بوە نوینەری ولایەتی موصل « نائب » •

ئیسماعیل خان لەم کاتەدا زور دەستی کورت بو ، مالی تالان کرابو تورکەکان پارەی زوریان بردبو ، ئەحمەد تەقی کە بوە

نوینەری ولایەتی موصل ، لای کار بەدەستانی حکومەتی تورك زور هەولی بو دا کە ئەم پارەیە بە تالان رویوەی بدەنەوە ، پاریدەی بدەن و کورەکەی کە بە دیل گیرابو بەرەلای بکەن کاربەدەستانی تورك زوریان بە دڵ دەیان ویست یارمەتی ئیسماعیل خان بدەن وە رایبکیشن بو لای خویان داوایان لی کرد کە ئیسماعیل خان پیویستە خوی بیتە مەرکەزی ولایەت وە سەر بو حکومەت دابنەوینی وە دلسوزی خوی پیشان بدات بەو مەرجەش دل لە دات نەدات لە کاتی هاتنیا وە بەلینی شەرەفی ئەدریتی کە هیچی بو نابی لە چاکە بەولاوە •

فەرماندەری سوپا ووتی ، لەو پارەیەی هەیەتی لای حکومەت هەزار لیرەی ئەدەینەوە ، وە بە دیاریش هەندیك تفەنگ و فیشەك و تفاقی جەنگی بو دەنیرین ، وە هەر وەها ئیستا لە گەل رشید جودت وە یوزباشی « رائد » وەهبی یاوەردا بچن بو لای ئیسماعیل خان ئەم دوو سەد لیرەیەی بو بەرن •

رشید جودت و وەهبی بەگ و ئەحمەد تەقی دیاریەکەیان برد بو ئیسماعیل خان وە پییان ووت ئەبی خوی بچیتە مەرکەزی حکومەت « ناوچە » و بەلینی شەرەفیشیان داوە کە دلنیا بیت خان توزیك بیری کردەوەو لیکی دایەوەو ووتی : هەرچی ئەبی با ببی ، چونکە ئەم باشترە ، لیرە من پەریشان کەوتوم ، کەسی خوی لە من ناگەیەنیت ، تەنانەت خزم و دوستی زور نزیکیشم لە بەر ئەوە بەلینی هاتن ئەدەم ، یاوەرو وەهبی بەگ کە

یاوەری فەرماندەری سوپای تورك بو بانگیان کرد ، خان پی ی ووت ، عەرزی فەرماندەر بفەرمون من ئامادەم ئەو چی فەرموە بیکەم وە ئەوەی بیشیەویت ئەیکەم ، ئنجا ئەحمەد تەقی و یاوەرەکە پیکەوە گەرانەوە بو « وان » پاشس دوو روژ ئیسماعیل خان خوی و پیاوەکانی چون بو « وان » بە راستی فەرماندەری سوپاو هەموو ئەفسەران وە کاربەدەستانی حکومەت هاتن بو پیشوازی و بەخیر هاتن کردنی ئیسماعیل خان ، خان لە مالی فەرماندەری سوپا میوان بو زور ریزی لی گیرا ، هەزار لیرەی ئالتونی درایە لە گەل هەندیکی تریشس چەك و تفاقی جەنگی ئەمجارە ئەوانەی نەدەهاتن بە لای ئیسماعیل خانداو توخونی نەدەکەوتن هەموو هاتنەوە دەوری و وە لی کوبونەوە ، تا دوینی بو پشتیان تی دەکرد ، ئەمرو کرنووشی بو دەبەن ، ئیسماعیل خان بە ئەحمەد تەقی ووت : چاوت لی یە چون دەوریان داوم ، بلیین چی ، ئیمەش تووشی ئەم نەتەوە بەد بەختە بوین ، ناچارین هەر چونیك بیت ئەبی لە گەلیانا رابویرین .

فەرماندەری سەربازی گشتی بروسکەیەکی لیدا بو «ئەنقەرە» لە بارەی دلسوزی ئیسماعیل خانەوە ، وە گفتو گویەکی نهینی کرا ، بە ئیسماعیل خانیان ووت : حکومەتی ئەنقەرە بریاری داوە هەزار سەربازی پر چەکی تورك بە جلو بەرگی نەتەوایەتی کوردەوە بخەتە ژیر فەرماندەتانەوە لە گەل هەموو هیزی نەتەوەدا ، وە حکومەت چیتان پیویست بی بوتان ئامادە دەکا

کنە بەم هیزەوە بچنە ئیران شوین‌و جیگای خوتان بگرنەوە ، لەوی ئەحمەد ئاغای برات بە وەکالەتی خوت دابنی ، خوشتان بە هیزەکەتانەوە بچن بو کوردستانی خوارو بو یاریدەدانی شیخ مەحمودو عباس ئاغا پیکەوە لە دژ ئینگلیز ، ئیسماعیل خان بەم خەبەرە رور دلشاد بو ، وەك گول گەشایەوە ، فەرماندەر ووتی ئەم خەبەرە زور نهینی‌یە بە کەس مەلین ، ئیوە بچنەوە جیگای خوتان ، منیش ولیرە هەزار سەربازەکە ئامادە دەکەم لە گەل ئەفسەرەکاندا دەیان نیرم بو « باشقەلا » ، ئیسماعیل خان زور بە دلشادیەوە گەرایەوە ، فەرماندەری سوپا لە پاش ئامادە کردنی سەربازەکان هات بو میوانی ئیسماعیل خان ، لە کاتیکا کە لە لای ئیسماعیل خان بو بروسکەیەکی « شفرە »ی بو هات ، فەرماندەرەکە خویندیەوە زور رەنگی بزرکاو گرز بو ، بەلام‌ئەو شەوە هیچ نەی ووت ئەم بروسکەیە چی‌ی تیایە ، بو سبەینی بە ئیسماعیل خانی ووت با پیکەوە بچین بو « یاشقەلا »لە دێ فەرماندەر بروسکەکەی دەرهیناو خویندیەوە بو ئیسماعیل خان تەلگرافەکە لە شخصی « مصطفی کمال »ەوە هاتبو ئەلیت : باری سیاسی بەینی دەولەتان ناچاری کردین کە فەرماتتان بدەینی کە جولانەوەکەی ئیسماعیل خان دوا بخەن ، خوتان‌و سەربازەکان بچنەوە مەرکەزی ولایەت ، سلاوم بگەیەنە بە ئیسماعیل خان‌و ریزی بگرن‌و بەرامبەر ژیانی پر لە کامەرانی چی پیویستە بوی بکەن ».

ئیسماعیل خان که ئەمەی بیست ، سست بو وەك مردوی لی هات زور دل تەنگو زویر بو بەلام هیچ دەستەلاتی نەبو ، بە ئەحمەد تەقی ووت : هەرگیز هەلی وامان بو هەل ناکەویتەوە هەر ئەوەندە زەحمەت بو تا بگەیشتمایە « چاری » ، بلیین چی بەختو شانس یاریدەی نەداین .

لە دوای ماوەیەك دەرکەوت کە مەبەستی تورکەکان لەم جولانەوەیە چی بوە ! ئاثوریەکانو نەستوریەکان لە قەزای موصلدا لە عیراق بە هاندانی ئینگلیزەکان هیرشیان بردوتە سەر سنووری تورك لە بەشی « زاخوو چولەمیرگ »دا ، وە لە گەل سەربازی تورکدا شەر دەکەن ، مصطفی کمالیش ئەیەوی بەرامبەر بەم جولانەوەیە بو تولە سەندن ئەم جولانەوەیەی ئیسماعیل خانی سمکو پیك بینیت ، لە پاشا ئینگلیزو تورك پیکەوە ریك کەوتنو سنوریان دانا لە بەینیاندا کە بە سنووری « بروکسەل » ناو دەبریت لە بەر ئەوە هەردوو لایان وازیان لە جولانەوە هیناوە ، جا ئیسماعیل خان کە ئەمەی بیست لیرەدا ووتی « تورکەکان کوردەکان وەك نوکەر تەماشا ئەکەن ، بە پیی ئارەزووی خویان یاریمان پی ئەکەن » .

ئیسماعیل خان ناچار گەرایەوە بو جیگاکەی خوی . لەم کاتەدا « ئەنجومەنی دەولەتان » « عصبە الامم بریاریدا ووتی « کیشەی موصل ئەبی رای گشتی دانیشتوانی ناوچەکان وەربگیریت » بویە کومەلیکی چەند کەسی ناردە عیراق بو وەرگرتنی دەنگ

لـه دیـار بەکـرەوە « فەتـاح بـەگ »ی ژن بـرای شـیخ مەحمـودو « ناظـم بـەگ » یـان لـە گـەل کومەلیکـا نـاردوە ، « ناظـم بـەگ ـ ناظـم نەوتچـی خەلکـی کەرکوکـە » وە داوایـان لـە ئەحمـەد تەقـی کرد کـە بـو پـرو پاگانـدە بـلاو کـردنەوە بـچـی بـو ناوچـەی رانیەو پشـدەر ، •

کومـەلی دەنـگ وەرگـران تەنیـا لـە شـارەکانا دەنگیان وەرگرتو گـەرانەوە بـو تورکیـا ، ئـەوانەی دەنـگیان دابـو زوریـان سـەر بـە ئینگلیـز بـوون • لـە ئەنجامـدا ولایەتـی موصـل لـە لایـەن ئەنجومەنی دەولەتـان » « عصـبە الامـم »ەوە درایـە ئینگلیـز ، بـەم جـورە ئینگلیز بـو دەسـت کەوتو چاکـەی خوی مافـی نەتـەوایەتی کـوردی کـرد بە ژیـر لیـوەوە ، بـو ئـەوەی سـەر بـە تـورك دانەوینـیو ولایـەتـی موصـلی دەسـت کـەوی •

★ ★ ★

## گەرانـەوی شیخ مەحمود لە دیلی : ـ

پاشـن بـە دیـل گرتنـی شـیخ مەحمـودو دور خستنـەوەی ، ولاتی سولەیمانـی بـە تەواوی ئاسـایشی تیـا نەمـا ، روشـن بـیرانو پیـاو ماقـولانی کـورد هەموو بـو رزگـار کردنـی کـورد هەولیـان ئـەدا

وە کوششیان ئەوەبو کە دەولەتیکی سەربەخوی کورد دابمەزرینن بەم بونەیەوە شورش لە هەموو لایەکا دەست پی کرا ، لە هەموو شارەکانی کوردستاندا حکومەت دەسەلاتی نەما ، ئینگلیزەکان لە شارەکانا بە پەلە پروزکی خویان دەرباز کرد ، ئەم هەموو هەراو جولانەوانە ، سیاسەتی ئینگلیزی شلوق کرد ، وە ئینگلیز چوار چاو بوبو ، ناچار کرا کە دان بنی بە راستیا کە پیویستە بە زوترین کات شیخ مەحمود لە دیلی‌یەوە لە هندستان بگیریتەوە بو کوردستان بو سولەیمانی وە بیکاتەوە بە حکمداری کوردستان ، لەو ماوەیەدا کە شیخ مەحمود دور خرابووە بو هندستان ، تا گەراندنەوەی بو کوردستان لە بەغداددا حکومەتیکی عەرەبیش پیک هات ، ئەم حکومەتەش بەم جورە دامەزرا : ـ

## کونگەرەی قاهرە : ـ

لە روژی ٩ی مارتی ١٩٢١زدا بەریتانیا لە قاهیرە کونگەرەیەکی سیاسی گەورەی بەست بو دوانو لی‌کولینەوە لە کارو باری سیاسی روژهەلاتی نزیک « مستەر چەرچل » وەزیری مستعمراتی بەریتانیا وە « کولونیل لورەنس » بە جووتە لە بەریتانیاوە هاتن وە « سیر پەرسی کوکس » بالیوزی بەریتانیا لە عیراق وە « جەنەرال هلدن » فەرماندەری گشتی سوپای بەریتانیا لە عیراق وە « جعفر عسکری » وەزیری بەرگری عیراق وە « ساسون حسقیل »

وەزیری دارایی عیراق وە « مسس بیل » سکرتیرەی بالیوزخانەی بەریتانیا لە عیراق هەموو لەم کونگرەیەدا بەشدار بوون ، لەدوای گفتو گو کردن بریاریاندا حکومەتیکی سەربەخوی عەرەبی لە عیراقدا دابمەزرینن وە « فیصل کوری حسین »ی شەریفی مەکە بکەن بە « شا » لە دوای ئەوەی کە بویان دەرکەوت کە لە عیراقدا پیاویکی وایان دەست ناکەوی ببی بە دار دەستیان چون چون بیانەوی هەلی سورینن وە لەم کاتەدا ئەمان پشتی پی‌بەستن.

شیخ مەحمود پاش سێ سال دورخستنەوە گیرایەوە بو سولەیمانی لە روژی ١٤ ایلولی ١٩٢٢زدا ، لەم روژەدا لە سولەیمانی کونگرەیەکی گەورە گیرا ، شیخ مەحمود کرا بە « ملکی کوردستان » ئالای سەربەخویی هەلکرا ، وەزارەتیکی دامەزراند لە دە کەس : ــ

١ ــ شیخ قادر شیخ سعید برای شیخ مەحمود کرا بە سەروك وەزیرانو سوپاه سالار .

| | |
|---|---|
| ٢ ــ مصطفی پاشا یاملکی | کرابە وەزیری فەرهەنگ « معارف » |
| ٣ ــ عبدالکریم عەلەکە | وەزیری دارایی |
| ٣ ــ شیخ محمد غریب | ــ ــ ــ ناوەوە |
| ٥ ــ صالح زەکی صاحبقران | ــ ــ ــ هیزی نەتەوە |
| ٦ ــ ئەحمەد بەگی فەتاح بەگی صاحبقران | ــ ــ ــ گومرك |

٧ ـ حەمە ئاغای عبدالرحمن ئاغـا — — — نافعە

٨ ـ سید احمد بەرزنجەیی « دان زیرین » سەروکی ئاسایشی گشتی

٩ ـ حاجی ملا سعید کرکوکلی زادە ـ وەزیری دادگـاه

١٠ ـ صدیق القادری مفتشی گشتی هەمو کوردسـتان

لـە دوای دامـەزراندنی وەزارەت دەسـت کـرا بـە ریـك خستنی کـارو بـاری دەولـەت ، نووسـینی دایـرەکان هەمـووی بـە کوردی بـوو ، پوولـی پوسـتە لـە چـاپ درا ، کوردەکـان زور شـادو دلخوش بـوون بـە حکومەتـەکەیان ، ئەوەنـدە هەبـوو کـە ئـەم حکـومەتو ریـکیو پیکـییەو ئـەم ملکیەتـە تەنیـا بـو شـاری سـولەیمانـی بوو شـیخ مەحمـود بـەمە قایـل نەبـو کـەوتـە داوا کـردن کـە هەمـوو شـارەکانـی تـری کوردسـتان وە هەموو نـاوچەکانـی کوردسـتانی عیراق بینـە ژیـر ئـالای کوردسـتانەوە ، لـەم کاتەشـا « ئوزدەمـیر »و مەفرەزە شـرەکەی تـورك لـە رەوانـدز هەولـی ئـەدا کـە خـوی لـە « ملك » شـیخ مەحمـود نـزیك بکـاتەوە وەك لـەوە پیشـی باسـکرا ، بەراستیشی « ئـوزدەمیر » گەیشـت بـە مەبەسـتو مـەرامی خـوی ، ئینگلیـزەکان ئاگایـان لـە هەمـوو کەینـەو بەینـەیەکی شـیخ مەحمـود هەبـوو کـە چـی دەکـا ، باریشـی لـە شـاری سـولەیمانیدا زور گـوررا ، خزمەکانی شـیخ مەحمـود بـە بوونـی شـیخ بـە ملـك زور گومـرا بـوون وە دەسـتیان خسـتە نـاو هەمـوو کـارو بـاریکـەوە وە ئەیـان ووت مادام

شیخ مەحمود ملکە ، ئیمەشن هەموو شتیکین هەر یەکە لە لایەکەوە کزیریك بوون ، کەس گویی نەئەدایە کەس زنجیرەی کارو بار لە یەك ترازابو کەس لە کەسی نەدەپرسیەوە لەم ناوەدا چینی هەژارو کاسبی ناو بازاری تیا چوبو بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندیان نەبوو بە شیخانەوە ئەمنە لە لایەکەوە .

لە لایەکی تریشەوە ئەوانەی روشن بیرو دنیا دیدە بوون ئەیان ووت « سیاسەتو خزمایەتی لە یەك دوورن ، ئەوان لەو بیرو باورەدا بوون کە مەیدانی سیاسەت ئەبی زور فراوان بیت» لە هەر لایەکەوە هەوا هات ئەبی لەو لایەوە شەن بکریت ،وە ئەبی ئیمە واقعی بینو دوای کلاوی با بردو نەکەوین ، وە لەو باوەردا بوون کە ئەمانی تورکو هاتنی ئینگلیز دەرویکی گەورە بووە لە کورد کراوەتەوە ، لە بەر ئەوە ئەبی کورد ئەمرو شان بە شان لە گەل ئینگلیزدا بروات تا خوی دەکا بە حکومەتیکی بەهیزو توانا ، چونکە ئەوە ئاشکرایە ئەگەر ئینگلیز نەبوایە کورد ئەم حکمرانیەی وەر نەدەگرت .

هەندیکی تریش هەبوون تورك خوا بوون بە ناوی ئیسلامیەتەوە دەهولیان دەکوتا ، ئەمانە هەموو مەئمورو موچە خورە کونەکانی تورك بوونو بی ئیش مابونەوە لە بەر ئەوە هەموو پروپاگەندەیان بو تورك ئەکردو ئینگلیزیان بە کافر دادەنا .

« میجەر نوئیل » زور هەولو تەقەلای دا کە شیخ مەحمود بە

لـەم بـیرو بـاورانە دور خاتـەوەو نەیەلیـت جـل خوارەکانو «ئوزدەمیر» دەسـتی بیـرنو کـاری لـی بکـەنو لـە خشـتەی بـەرن ، « میـجەر نـوئیل » کـە زانـی هیـچی بـو ناکـری کـارو بـاری دایـە دەسـت « چەپمـەن »و زور ئاموژگـاری کـرد کـە ئاگـای لـە شـیخ مەحمـود بیـتو نەیەلیـت ئـەو جـل خـوارانە لـە ریـگا لای بـدەن ، شـیخ مەحمـود تووشـی داوی جـل خـوارەکان وە « ئوزدەمـیر » بوبـو وە ئـەوانەی لـە دەورو پشـتی مابـونەوە هەمـوو لـەو جـل خوارانـە بون بـە سـەروکایەتی « تایـەری ئەمـینئەفەنـدی » •

پەیـوەندی بەینـی جـل خوارەکانو شـیخ مەحمـود روژ بـە روژ لـە زیـادی بـو ، ئـەم کـردەوەیەی شـیخ مـەحمـود زیانیـکی زور گـەورەی هەبـوو بـو خویو حکـمرانیەکەی ئینگلیـزیش •

« چەپمـەن » کەوتـە خـوی ئەویشـس کومەلیکـی لـە خـوی کوکـردەوە دەسـتیان کـردەوە بـە روخانـدنی حکومەتـی دووەمـی شـیخ مەحمـود بـە تەواوی لـە یـەك ئاشـکرا بوون ، ئاشـی بـەدبەختی حکومەتـی کوردسـتان هیشـتا هـەر لـە گـەرا ـوو ، شیـخ مەحمود ئـەوەندە لـە ئینگلیـز چـوبو بـە قینـا تـا دەهـات شیر گیر تـر ئـەبوو نیـازی وابوو هـیرش بەریتـە سـەرکەرکـوك ، لـەم کاتـەدا ئیسـماعیل خانـی سـمکوش هـات بـو دیـدەنی سـولەیمانی بـو لای شـیخ مەحمـود وە بـووە میـوانی حکومەتـی کوردسـتان ، هاتنی سمکو لـە کاتیکـا بوو کـە شـیخ مەحمـودو ئینگلیـز شـیرو تـیریان لە یەك ئەسـوو •

ئینگلیـزەکان ویسـتیان شـیخ مەحمـود لـە سـولەیمانی دەربەرینن بویـان نـەدەکرا ، لـە ئەنجـاما بـریاریاندا کـە بومبـا بـارانی شـاری سـولەیمانی بکـەن لـە روژی ۲۳ / ۲ / ۱۹۲۱زدا بەیاننامەیـان بـە فروکە فـریدایە خـوارەوە داوایـان لـە ئیسـماعیل خانـی سـمکو کـرد کـە سـولەیمانی بـە جـی بیلیـت چونکـە ئەیانـەوی بومبـا بارانی سولەیمانی بکـەن نایانـەوی ئـەوو ئـەوانـەی لـە گەلیـان تووشـی زیـان بـن •

لـە روژی ۲٦ / ۲ / ۱۹۲۳زدا بەیـان نامەیەکـی تـریان بـو شـیخ مەحمـودو دانیشـتوانی شـاری سـولەیمانی بـە فـروکە بـە سـەر شاری سولەیمانیدا بـەردایەوە ، داوایـان لـە شـیخ مەحمـودو دانیشـتوانی شـارەکە کـرد کـە چولـی بکـەن چونکـە بومبـا بـاراز ئەکـەن •

ئیسـماعیل خانـی سـمکو لـە روژی ۲۸ / ۲ / ۱۹۲۳زدا سـولەیمانی بەجـی هیشـت ، رشـید جـودت لـە گەلـی چـوو ، گەرانـەوە بـو ناوچـەی خویـان ، پاش ئـەوان شـیخ مەحمـود بـە لەشـکرەوە چوە ئەشکەوتەکانـی « جاسـەنە » دانیشتوانـی شـارەکەش رویـان کـردە دیهاتـە نـزیکەکان لـە شـارەوە لە تاریـكو لیلـی بەیانی ٤ / ۳/۱۹۲۳زدا فـروکەکانـی بەریتانیـا سـلەیمانیان بومبـا بـاران کـرد •

شـیخ مەحمـود لـە روژی ۱۱ / ٦ / ۱۹۲۳زدا بـە لەشکـرەوە هیرشی هینایـەوە بـو سـەر شـاری سـولەیمانیو داگـیری کـردەوەو دەستـی کـردەوە بـە حکـمرانیەکـەی جارانـی ، ئینگلیـز بـە تـەواوی بـوی دەرکـەوت کـە شیخ مەحمود کەلکـی ناگـریت دەسـتی تەواوی لـی شت لـە بـەر ئـەوە ویسـتی بـەرامبەر بـە کـورد سـیاسەتی بگـوری زانی

بی شیخ مەحمود ئەتوانی شتیك بكا ، لە بەر ئەوە حكومەتی عیراق‌و حكومەتی بەریتانیا پیكەوە بە جووتە بەیانیكیان بو كوردەكان بلاو كردەوو دانیان نا بە مافی نەتەوایەتی كوردا ئەلین : ـ

« كوردەكان ئەتوانن حكومەتیكی كوردی لە ناو چوار چیوەی عیراقدا پیكەوە بنین ، وە ئەتوانن پیاو بنیرن بو بەغداد بو گفت‌و گو كردن لە بارەی كارو باری سیاسی‌و ئابوری ئەم حكومەتەوە لە گەل دوو حكومەتی بەریتانیاو عیراقدا»

ئینگلیزەكان مەبەستی بەرو دوایان لەم بەیانە ئەوەبو بزانن جگە لە شیخ مەحمود لە ناو كوردەكانا كەس هەیە ئەم پركیسی‌یە بكات ؟ كی هەبو بچی بو بەغداد ؟ كی هەبو لەو كاتەدا بتوانی بەربەرەكانی شیخ مەحمود بكاو شان لە شانی بدا ؟ كی هەبو بەرامبەری بوەستی ؟ بی گومان كەس .

لە دوای بلاو كردنەوەی ئەم بەیانە ئیتر پی‌ویست نەما بە حكومەتی شیخ مەحمودو مانی شیخ مەحمود بە ملكی . لە بەر ئەوە ئەم بەیانە كوتابی هینا بە تەمەنی ئەو حكومەتە نازدارە .

حكومەتی عیراق‌و حكومەتی ئینگلیز دەستیان دایە دەست یەك بو لە ناو بردنی حكومەتی شیخ مەحمود ، هیزیكی سەربازی لیوی لە گەل هیزی بەریتانیا بەرەو سولەیمانی هاتن ، شەر لە دەورو پشتی چەمچەمال‌و بازیان كرا ، بەلام ئەمجارە شیخ مەحمود ئەوەندە خەلكی لە دەورو پشت نەبو بویە سوپاكەی لە توانایا نەبو كە بتوانی ئەو شورشە گەورەیە بەربەست بكاو بیان گیریتەوە لە بەر ئەوە لە كوتایی روژی ١٩ی تەموزی ١٩٢٤زدا شیخ مەحمود سولەیمانی بە

جی هێشت‌و سوپای ئینگلیزو عیراق هاتنە شاری سولەیمانی‌یەوەو حکومەتی دووەمی شیخ مەحمود کوژایەوە ، بە کوژانەوەی حکومەتی کوردستان بە تەواوی هەموو کوردیك دلگیر بو وە بوبوە داخیکی زور گەورەو ناسور چوبوە دلی هەموو کوردیکی دلسوزەوە ، ئینگلیزەکان هەستیان بەمە کردبو لە بەر ئەوە هەولی دل نەوایی کوردەکانیان ئەدا .

## شیخ مەحمودو ئوزدەمیر :ـ

شیخ مەحمود چون تەفرە درا ، چون لە خشتە برا ، چون راکیشراو بو بە داوی ئوزدەمیرەوە :ـ

ماموستا رەفیق حلمی بەگ لە بەرگی شەشەمی « یادداشت »ەکەیا زور بە وردی‌و بی لایەنانە وەك کوردیکی دلسوزی میژوو نووس ئەم بەسەرهات‌و رووداوانەی نووسیوە ، کە ئەمانە بەلگەیەکی تأریخی زیندون بو روون کردنەوەی ئەو بەسەرهات‌و رووداوانەی ئەو کاتە کە کیك وەك میژوو نووسی بە نرخ ماموستا رەفیق حلمی بەگ نووسیویەتی کە خوی یەکیك بووە لەو کەسانەی کە بە کردەوە لە حکومەتی کوردستاندا بەشدار بووەو دەوری گەورەی بووە وە یەکیك بوە هەرە نزیك کەسانی کەلەو کاتەدا لەملکی کوردستان شیخ مەحمودەو

نزیك بوە بویە نووسینەکانی بە بەلگەیەکی تاریخی پر لە راستی ئەدریتە قەلەم ، میژوو نووس ئەلیت : ــ

شیخ مەحمود کە گەرأیەوە لە دیلی و سولەیمانی لە نوینەرانی ئینگلیز تەنیا « میجر نوئیل »ی لی‌بو بو چاودیری کردنی کارو بار لای شیخ مەحمود ئەویش تورك خواهەکان بە توندی گەمارویان دابو وە ماوەیان نەئەدا کە لە شیخ مەحمود نزیك بکەونەوە ، بوبون بە چەپەریکی ئاسنین لە بەینیاندا « مصطفی پاشا یاملکی »ش هەر بە هاندانی ئەمجل خوارانە زور لەشیخ مەحمود دوور خرایەوە ، تەنانەت دەنگ وا بلاو بو کە « ئوزدەمیر » هەولی ئەوە ئەدا کە « مصطفی پاشا »ی بدریتی‌وبیکا بە دیاری دەستی بینیریت بو « مصطفی کمال » بو ئەوەی بیکا بە سی‌دارەدا « قەنارە » تا بەم جورە تولەی تورك لە نەمرودی کورد بسەنریتەوە ، بەلام ئەم کردەوە ناشرینە پیشەی پیشەوایەکی دلیری وەك شیخ مەحمود نەبو وە لە قارەمانیکی وا نەدەوەشایەوە .

« مصطفی پاشا » کە لە تورکیادا بە « مصطفی نەمروود » ناوی دەرکردبو کوردیش نەبوایە لەو روژەدا بی پشتیوانو بی دەسەلات بو ، پیشەی کوردیکی دلیری وەك شیخ مەحمود نەبو کە بیداتە دەست دوژمنی بو ئەوەی بی‌نیریتە پای قەنارە .

پیاوی هەرە بە دەسەلاتی ئەو روژە « تایەری ئەمین ئەفەندی مەسرەف »بو لە « بلاط »ی شیخ مەحمودا لە لای ملك دەسەلاتی « تایەر » کە سەروکی جل خوارە تورکیزمەکان بوو گەلی لە ژورو دەسەلاتی « نوئیل »ەوە بو بەم بونەیەوە نرخی تورکەکان لە « بلاط »ی حکومەتی کوردستاندا دیسانەوە

کەوتەوە گەر تا لە ناو شاری سولەیمانیش‌دا ٠

ئەفسەرانی ئوزدەمیر وەك پەپولە بە ناوچەکانی رەواندزو ناو خیلەکانی کوردا دەسورانەوە پیش ئەوەی شیخ مەحمود لە بەغدادەوە بگاتەوە سولەیمانی هەرەشەی ئەوەیان دەکرد کە بین سولەیمانی بگرن،بەیاننامە پر لە پرو پاگەندەکانی ئوزدەمیر کە بە وینەیەکی جوان‌و رازاوە لە چاپ درابوون بە مانگ‌و روژی نیشانەی ئالای تورك نەخشینرابون بە دەست خەلکی شارەوە فرکان فرکانی‌بو بە ئاشکرا ئەخوینرانەوە ، ئینگلیزەکان تەنیا « نوئیل »و « چەپمەن »یان هەبو کە هانی شیخ مەحمودی پی بدەن‌و تورکی پی بکەنە دەرەوە ، شیخ مەحمود ماران گاز بو ، لە دەست وەشاندنی تورك زور سلی ئەکردەوە واش بـرابوە میشکیەوە کە موصل بی‌گومان ئەدریتەوە بە تورك وە یان بە زوری زورداری‌و هیزی چەك ئەیسینیتەوە ، چونکە ئینگلیزەکانیش لە هەموو لایەکا لە شکستا بوون بەرامبەر بە « کەریم بەگی فەتاح بەگ »و چەند سواریکی لە بازیان‌و لە سەنگاو لە ناوچەی قەرەداغ ، وە هەروەها بەرامبەر بە بەشیك لە پشدەریەکان‌و هاوپەیمانەکانیان لە دەربەندی « رانیە » کە شکابوون‌و رایان کردبو بو «کویە» وە هەروەها سولەیمانیان بە پەلە بە فروکە چول کردو بە جی‌یان هیشت وە بەرامبەر بە مەفرەزەیەکی شری تورك لە رەواندز ، بی‌دەسەلاتی ئینگلیز بە تـەواوی دەرکەوتبو ، تەنیا ئەوەیان بو مابووە کە لە دورەوە تەماشا بکـەن ، زوربـەی خیلەکانی کورد لە گەل ئوزدەمیردا بوبونە یەك ، جل خواریش لە ناو شـاری سولەیمانی‌دا پەرەی سەندبو وە هیجگار زور بوبون ، لە بەر ئەمانە هەمووی شیخ مەحمود کە گەیشتە سولەیمانی « تایەری ئەمین ئەفەندی » چوە بن دەستیەوەو

چوه بن کلیشه‌یه‌وه ، بیرو باوری گوری ، وای لی کرد هه‌موو کارو باریکـی « یلاط »ی ملکی که‌وته ژیر ده‌ست تایه‌ره‌وه له سه‌ر په‌نجه‌ی ئه‌و ده‌گه‌را ، ئه‌مه‌ش مانای ئه‌وه‌بو کارو باری حکومه‌تی کوردستان له سه‌ر پیلان‌و نه‌خشه‌ی ئوزده‌میر ده‌برا به ریوه ، ئینگلیزه‌کانیش چاوه زه‌قی‌یان بو ، له لایه‌کی تریشه‌وه له‌و روژه‌دا هه‌موو روژنامه‌کانی به‌ریتانیا به توندی داوایان له حکومه‌تی به‌ریتانیا ده‌کـــرد که سوپای به‌ریتانیا له عیراق‌و کوردستاندا بکیشریته‌وه بو به‌ریتانیا چونکـه نه‌ته‌وه زور له شه‌ر بیزاره‌و ئه‌نجامی شه‌ری گه‌وره‌یان ئه‌خسته به‌ر چاوی کـار به‌ده‌ستانی به‌ریتانیا که چو ن‌ئه‌و زیانه گه‌وره‌یه‌ی له مال‌و له گیانیان که‌وتبـو ، به‌هوی شه‌ره‌وه ، تا جاریکی تر سه‌ر له نوی تازه نه‌کریته‌وه ، له بـه‌ر هه‌نـدی ده‌ست که‌وت‌و سودی که‌م له عیراق‌و کوردستانا وه نه‌ته‌وه به دوو باره پاتـی جه‌نگ سه‌ر له نوی بخرینه‌وه ژیر باری قورس‌و گـرانه‌وه ، شیخ مه‌حمـودی به‌سزمان له روژیکی وادا هاتبووه بو سوله‌یمانی ، پشتـی به چـی‌و به کـی ببه‌ستایه‌و ئومیدی به چی وه به کی ببوایه ؟ بی یارمه‌تی‌و بی پول‌و پاره بی چه‌ك‌و تفاقی جه‌نگی چون بچن به گژ تورکا ؟ بی یارمه‌تی‌و بی پول‌و پاره بی چـه‌ك‌و بچوایا به گژ تورکا خیله‌کانی ده‌ورو پشتی سوله‌یمانی هه‌موو پشتیان ئه‌گرت ؟ له کاتیکا که تورك هه‌ر ئه‌و مه‌فره‌زه‌یه‌ی ره‌واندزی هه‌بو هیچ هیزی تری نه‌بو ؟ ئه‌گه‌ر تورك بیتوانیایه هیزیکی تر له هیزه‌که‌ی ره‌واندز به‌هیز تـری بهینایه چی رووی ئه‌دا ؟ ئه‌وانه‌ی له گه‌ل شیخ مه‌حمود بوون تا چ راده‌یه‌ك له گه‌لی‌ئه‌مانه‌وه له‌م شه‌ره‌دا کی پشتیوانی ئه‌کردن ؟ سبه‌ی روژی ولایه‌تی موصل بکه‌وتایه ده‌ست تورك شیخ مه‌حمود چی ئه‌کرد ؟ .

ئەم هەموو پرسیارو راووریویە خرابوە بەردەمی شیخ مەحمود وەگویچکەی پر کرابو بو ئەوەی مەترسی بخەنە دلەوەو واز لە ئینگلیز بینیت‌و لە ئوزدەمیر نزیك بیتەوە ، ئوزدەمیریشس چ راستەو راست وە چ بەهوی دەست‌و پیوەندەکانیەوە لە کارا بو ، بە پرو پاگەندەی « اسلامیەت‌و ، غەزاو ، دین‌و » تولە سەندن دەماری شیخ مەحمودیان گرژ کردبو وە هینابویانە جوشس ، لە ناو دەست‌و پیی ئەم دروو دەلەسەو پرو پاگەندانەدا ناوی کوردو کوردستان‌و سەربەستی سەربەخویی کورد بوبو بە ژیر لیوەوەو زور کز یو خەریکی لە بیر چونەوە بو ، ئەوانەی کە نیشتمان پەروەر بوون بە ئینگلیز خوا درابونە قەلەم لە لایەن جل خوارەکانەوە هەموو مەترسیان لە گیانی خویان پەیدا کردبو لە ترسانا کونە مشکیان لی بوبوە قەیسەری ، شیخ مەحمودی بە سزمان لە ناو ئەم بارە ئالوزەدا وەستابو راویژکەریکی سیاسی‌و ژیری نەبو کە پرکیشی بکاو بچیتە بن دەستیوەو بیخاتە سەرریی راست‌ورابەری بکا ، یارمەتی دەریکی بەهیزو نیشتمان پەروەریشس نەبو پشتی بگری •

ریکخراوە سیاسیەکان لەو روژەدا لە گیانەلاوا بوون ، لە بەر ئەوە پەت بەرەلا کرابو هەرکەس لەسەریکەوە بەلای خویدا رایدەکیشاهەرگیزنەدەگونجا دوو کەس یەك بگرن‌و لە یەك باوردا بن ، چونکە کەس باوری بە کەس نەدەکرد باورو وورە نەمابو ، بە کورتی ریکخراویکی سیاسی هەبو بەلام ریکخراویکی سیاسی وا نەبو کە لە هیزو توانایەدا بیت‌و خاوەن تەنزیم بیت پشتی‌پی ببەستریت‌و پالی پیوە بدریت‌و کورد کەلك‌و سوودی لی وەرگریت ، واتە لەو روژەدا ریکخراویکی سیاسی بە توانای وا نەبو کە راست بیتەوەو بیتە کایەوەو بکەویتە بەربەرەکانی لەگەل ئەو هیزو هویانەدا کەلەو کاتەدا دەورو پشتی شیخ‌مەحمودیانە

گرتبو وه له هەر چوار لاوه ئابلووقەیان دابو له دژ چاکەی کورد هەلدەسوران ، شیخ مەحمودیش بی گومان زور حەزی له حکمرانی دەکرد وه هەولی ئەدا ببی به « ملك » زوریش حەزی ئەکرد خزمەتی کورد بکا وه له پیاوی بەرزی کوردستاندا گیانی خوی بەخت بکا ، بەلام هیوای ئەوەی نەمابو بگات بە ئامانجی •

ئوزدەمیریش لەم کاتەدا زور وەستایانه لی‌ی ئەهاته پیشەوەو له گەلیا ئەجولایەوه ، به راستی شیخ مەحمود له هەلویستیکی زور گرنگ‌دا بو ، هەرچەند له دلا باوری به تورك نەبو ، وه به بەلینەکانی ئوزدەمیر زور باوری نەدەکردو فریویشی نەئەخوارد وه ئەوەیشی دەزانی که نزیك بونەوەی له تورك جی‌ی هیوایەکی تەواو نیه ، زوریش لەوه ئەترسا که ئەم سیاسەته ببیته هوی دوراندنی هەموو شتیك‌و دەست له بنی هەمانەوه دەرچون بەلام پرو پاگاندەی « تایەری ئەمین ئەفەندی »و « فەتاح ئەفەندی » ژن برای‌و سەر کردنه سەری زور کاری لی کردبو وه سەری لی شیواندبو‌و هەلیشیان فریواندبو ، هیچ ریگایەکی نەمابو وه لەو روژەشدا هیچی بو نەدەکرا به تاقی تەنیاو بی پشتیوان « ۱ » بە دەستی به تالەوه نەی ئەتوانی بچی به گژ تورکا •

---

« ۱ » که شیخ مەحمود گەرایەوه بو سولەیمانی له شکری تورك واته لەشکری ئەو کوردانەی بوبونه نوکەری تورك‌و سویند خوری بون گەیشتبوه دەورو پشتی شاری سولەیمانی ، ئەمەش بەمەدا دەردەکەوی که ئوزدەمیر نامەیەکی نوسیوه بو شیخ مەحمود له « ملحقی ۲۲ روژی ۲۹/ ۹ /۳۳۸ رومی‌دا » ئەلیت : ــ « مەفرەزەیەکی تورکم ناردوته دەورو پشتی سولەیمانی ز ر تکام هەیه به یادتانا نەیەت که شتیکی

لەو روژەدا ئینگلیزەکان ئەیان ویست کە شیخ مەحمود خوی هەموو شتیك پیکەوە بنی ، چەك و پارەو تفاقی لەشکرو شەر وە بچی بە گژ تورکاو دەریان بکا لە کوردستاندا ، « ۱ » •

ئینگلیزەکان ئەوەندە کردەوەی باشیان نەبو بەرامبەر بە شیخ مەحمود تا ئەو ئەم فداکاریەیان بو بکا وە بە جوریکی وا لی‌یان دلنیا نەبو کە متمانەیان پی بکاو بو سەرکەوتن‌و سەربەخویی کوردستان هەموو شت بخاتە بەر چاوسەرومالی لە ریگایا بەخت بکا ، لە لایەکی تریشەوە تورکەکانیش دانیان ناوە بە مافی نەتەوایەتی کوردا ، وە « ئوزدەمیر » بە ناوی مصطفی کمالەوە پەیمانی ئەوەی ئەدا کە لە کوردستانی عیراقدا وەك چون لە مصردا بو « محمد علی گەورە »یان کردبو « خدیوی »یەك لە کوردستاندا بو شیخ مەحمود دابمەزرینن وە بیکەن یە « والی »یەکی سەربەخو •

---

خرایم بە دلا هاتبی ، لە بابەت کردەوەیەك خوانە خواستە لەوانەبی لە ئیوەوە روو بدات ، ئیمە هەر لە دەمیکەوە ناسی راستی‌و پاکی ویژدانی ئیوەمان بیستوەو تی گەیشتوین کە بەرامبەر بە دەولەت‌و میللەت واتە « دەولەت‌و میللەتی تورك » پەیوەستیکی بەهیزو خوشەویستیەکی بی ریاتان هەیە ، لە بەر ئەوە ناوی ئیوە لە گیانی ئیمەدا جیگەیەکی بەرزو بەریزی داگیر کردوە ،

لە بەندی چوارەمی ئەم نامەیەدا ئوزدەمیر وتویەتی ئیمە ئیتر بە لامانەوە ئەوەندە مەبەست نیە کە مەفرەزەکەمان بیتە ناو شاری سولەیمانی یان نەیەت ؟ چونکە هاتنەوەی ئیوە بو سەر کار بار لە روی چاکەی دەولەت‌و مەبەستی نیشتمانی‌یەوە بو ئیمە « مانای بو تورك » بەسە ، ئنجا تا نا ماتان ئەگا وە ئەو

ترەوە لە دوانو گفتو گو دوا نەکەوت ، بەلام ئەوانەی لە گەل ئینگلیز بوون هیچیان بو نەکرا چونکە لە دبلوماسیەتی پر لە فرو فیلی سیاسیو پیچو پەنادا شارەزاییو دەستی بالایان نەبو ، « تایەر » بە تاقی تەنیا سەرکەوت چونکەتایەر لە دپلوماسیەتی لە خشتە بردنو هەل فریواندندا دەستی بالای هەبوو ، بەزبانی لووس وای لە شیخ مەحمود کردبو وە بە جوریك شارەزای تەبیاتی شیخ بوبو ئەیزانی چ دەماریکی دەگری بویە روژ بە روژ شیخ لە تورکەکان نزیك دەکەوتەوە ئەفسەرە تورکەکانی ئوزدەمیر پول پول ئەهاتنو ئەبوون بە میوانی شیخ مەحمودو بە شیوەیەیەکی نهینی لە گەل شیخ مەحمودا کودەبونەوە .

ئینگلیزەکان زور باش بەمەیان دەزانی ، شیخ مەحمود کە لە بەغـــداد گەرابووە بەلینی دابو بە ئینگلیزەکان کە تورکەکان دەربکا ، ئینگلیزەکان هەر داوایای ئەوەیان لی دەکرد ، بەلام تازە کار لە کار ترازابو ، شیخ مەحمود « ۱ » لە گەل تورکەکاندا ریك کەوتبو ، یان ریـــك کەوتنی لە ئەمروو سبەیدا بـــوو ، کوبونەوە نهینیەکانی تورکەکان لە گەلشیخ مەحمودا شتیکی کەم نەبـــو لای ئینگلیزەکان وە لە بەر چاوی ئینگلیز خواهەکـــان تورکیـــزمەکان بە ئینگلیـــز خواهەکانیان ئەوت تاوان بار وە ئەیان ووت ئەمانە بو کوشتن باشن ، لە بـــەر ئەوە لە شارا مقو مقو دەنگو باسیکی پر لە مەترسی بلاو بوەوە کە گـــویا بـــە فیتو هاندانی ئوزدەمیر بریار دراوە ئەوانەی سەر بە ئینگلیزن وە ئەو لاوانەی داوای نیشتمان پەروەر یئەکەن هەموویان بکوژنو لە ناویان ببەن ، « جمـــال عرفان » لەم روژانەدا کوژرا ، چون کوژراو کی کوشتی کەس نازانی ؟ لە بەر ئەوە ئەم دەنگو باسە ترسناکە کاریکی گەورەی کردبوە سەر بیرو باوری خەلك ئینگلیز خواهەکان هەموو خویان شاردبووەو لە کون نەدەهاتنە دەرەوە ، لاوە

باری سیاسی بەم جورە شلوق بو لە کوردستاندا لـەو روژەدا ، شیـخ مەحمود کەوتبوە ناو ئەم گەرداوو گیژاوی دەریای سیاسەتەوە ، سیاسەتی تورك لە بروزا بوو ، سیاسەتی ئینگلیز بەرەو لیژی ئەرویشت ، بەلام لە گەل ئەمەشا شیخ مەحمود تا ماوەیەکی باش خوی نەدایە دەستەوەو بیرو بـاوزی خـوی دەرنەخست وە بە نهینی پەچنیە دلی خوی ، ویستی هەردوو لا واتە ئینگلیـزو تورك تاقی بکاتەوە ، لە بەر ئەوە لە گەل تورکەکان بەهوی « تـایەر »ەوە لـە گەل ئینگلیزەکانیش بەهوی شیخ قادری برایی‌و مصطفی پاشا هەندی کەسـی

---

سیاسەتەکە بە تەمان لە سەری برون بومان روون کەنەوە ، مەفـرەزەکەمان لـەو جیکایەدا دەوەستی کە ئیستا الی‌یەتی ، ئەگەر بیت‌و ئیوە بە چاکی بزانن تا دەوری رانیەش دەکیشینەوە ئوزدەمیر داوای لە شیخ مەحمود کرد کە نەخشەی ئیش‌و کارو هەلسورانی خوی بو روون بکاتەوە .

« ۱ » لە راستیا تورکەکان لەو روژەدا بەهیز نەبون وە لە رەواندز ئوزدەمـیر لەشکریکی ریك‌و پیکی نەبو کە پشتی پی ببەستری ، وە بتوانـی سـەربەخو بـی یارمەتی کوردەکان لە کوردستاندا بجولیتەوە یان بەربەرەکانی لە گەل شیخ مەحمودا بکا بەلکو لە ژیرەوە بە دریژایی کات خەریك بو وە لە حکومەتەکەی ئەپارایە ە کـە هەندی سەربازی تریان هیچ نەبی چەند دانەیەك توپی بو بنیریت ، هەموو تەقەلاکانی بی سوود بوو ، لە بەر ئەوە لە یارمەتی حکومەتەکەی خوی هیوای بری‌بـو بـەلام بەختیاری تورك وە شانس‌و پرو پاگاندەو درووو دەلەسەی « تایەر »ی جل خوار وە کوردە گیلەکان کە بە هەزاران رویان دەکردە رە اندزو خویان ئەهاویشتە ژیـر سیبەری ئالای ئیسلامەوە ، بەهیزی کردبوون .

نیشتمان پەروەرەکانیش ترسیان لەوان کەمتر نەبو ، ئنجا لەم روژەدا وە لەناو ئەم بارە سیاسیە شلوقەدا کەس بیری لەوە نەدەکردەوە کــە شیــخ مەحمــود گەراوەتەوە داوای چی لی کراوە کە بیکاو بەلینی چی داوە بە ئینگلیز ؟ وە هەر وەها نەش دەزانرا کە شیخ مەحمود چی داوا کردوە بو کورد ؟ کەس لەمانەی نەدەپرسیەوە تەنیا مصطفی پاشا نەبی کە پیاویکی ئازاو دلسوزو دلیر بــو وازی لە رەخنە کردن نەدەهیناو هەمیشە ئەم دوو پرسیارەی ئەکردو بە دزیو بەئاشکرا توانجی لەم کردەوانە ئەگرتو لە دژی تورکەکان ئەدوا ، لەو بەولاوە کەسیکی تر نەبووە پر کیشی ئەوە بکا ناوی تورك بە خراپە بەریت لای شیخ مەحمود .

مصطفی پاشا وەزیری زانستی کە خاوەنی روژنامەی بانگی کوردستان بو ئەم بەیانەی لە روژنامەکەیا بلاو کردەوە کە بی دەسکاری دەینووســین : « ۱ »

---

« ۱ » یادداشتی رەفیق حلمی بەگ بەرگی شەشــ .

« ۱ » رەفیق حلمی بە لە یادداشتەکەیا دەلیت روژیکیان مصطفــی پاشــاو صدیق پاشا نادریو توفیق وەهبی ئەمین رەواندیو عەزیز قەزاز چونبودیدەنی ملکی کوردستان شیخ مەحمود ، پاشس مانەوەی چەند سەعاتیك کە هاتنە دەرەوە زانرا کە نەیان توانیوە شتیکی لی تیبگەن ە یان ئەوەی ویستویانەو بــیرو باوری خویان پیی بسەلمینن .

« ۲ » ئەبی مەبەسس لە پاشس بی نەك لە پیشس .

تەشریف هینانەوەی حضرتی حکمداری کوردستان دام شوکتە ، ئیتر میللەت کەوتە رفاەو استراحەتیکی واوە کە امثالی نەبینراوە وە هەر وەکو لە نسخەی « ۱۰ »ی بانگ کردستاندا نشر کرابو بو دەس کردن بە ئیشنو انتظام امور کردستان هیئەتی

جا نازانین ئەم بەیانە تا چ رادەیەکو بە چ جوریك ئەکەویتە بـەر چـاوی سیاسیو دپلوماسیەکانی دەولەتان ، چونکەئەوە دەردەخاکە ئەمبەیانە ناوەروکیکی پوختەی ئەو بەلینو پەیمانەیە کە لە بەغداد دراوە بە شیخ مەحمودو پەیمانـەو بەستراوە لە بەنی شیخ مەحمودو نوینەرانی بەریتانیادا ، چونکـە ئەم بەیانـە بەلگە « وثیقە »یەکی بە نرخە زور گرنگە لە میژووی کیشەی کوردی کوردستانی عـــیراق •

میجەر نوئیل کە راویژکەری سیاسی شیخ مەحمـــود بو لە کوردستانـی عیراقدا وە نوینەری مندوبی سامی بەریتانیا بوو ، بەو هیوایە دانیشتبو وە هەولو تەقەلای ئەدا کە شیخ مەحمود لە بەغدادو لە ئینگلیز نزیـك بخاتـەوە وە ریو شوینیکی باشی دابنیت بو شیخو حکومەتە تازەکەی ، لە بەر ئەوە زور هاتـو چوی کرد لە بەینی بەغدادو سولەیمانیدا ، بەلام لە ئەنجاما بـوی دەرکەوت کە هەرچی هەولو تەقەلای هەیە هەمووی بی سوودەو بە بادا دەروات ، کولی داو کارو باری دایە دەست « چەپمەن »ی « ۱ » معاونی خوشی پیگەیشتـن بەو

---

روسای محترمە کە کابینەی حکومەتی کوردستانی لی دامەزراوە با ارادەیی علیـە تعیین فەرموران ، ئەم هیئتی روسای محترمە کە لە ذواتـی ذی اقتـدار نامـدار هەلبژیرراون تشکیلاتی موقتە ، هەتا وەکو جنابی مندوبی سـامی دەولەتی فخیمەیی بەریتانیا کە لە بغدادەوە هەر وەکو وعدی فرموە موافقتـی خـەریطە عموم لیـواو قضاکان کوردستان الحاق افرمویتئەوسایە ارادە حضرت حکمدار دام شوکتـە لە کرکوکو اربیلو لە زاخو عەقرەو عمادیەو دهوکو صلاحیەو خانقینو سایر بلاد کردستان رجال محترمە دعوتو تشکیلاتی دائمی اجرا اکری . . . !

« ۱ » یادداشتی رەفیق حلمی بەگ بەرگی شەشس لاپەرە ۱۹ .

ئامانجەی کە هەی بو سولەیمانی بەجی هیشت کە جاریکی تر نەگەریتەوە بویە مندوب السامی بەریتانیاش کە باش لە هەوال گەیشت دەستی لە شیخ مەحمود شت ، وە ئومیدی بری ، « چەپمەن »یش خرایە ژیر چاودیری یەوە کەس نەی ئەتوانی ئامشوی بکا ، « چەپمەن » وەرس بوناچار ئیزنی لە شیخ مەحمود خواست کە بچیت بو کەرکوك و رویشت .

## ملکی شیخ مەحمود : ــ

لە پاش ئەوەی « میجەر نوئیل » رویشت و « چەپمەن » بوە وەکیلی وە چەپمەن یش ئیزنی لە شیخ خواست و رویشت بو کەرکوك ئەوە بو وەك باسکرا شیخ مەحمود لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا خوی کرد بە ملیکی کوردستان وە وزارەتیکی پیکەوە نا کە پیك هاتبو لە هەشت وەزیر و مفتش عام و مدیری ئاسایشی گشتی ئەم ملکیەتەی شیخ مەحمود تەمەنی زور کورت بوو ، پاش شەرو شوریکی گەورە لە گەل ئینگلیزا شیخ مەحمود ناچار کرا بە بەجی هیشتنی شاری سولەیمانی ، ئینگلیزەکان بو ئەوەی دلنیایی کوردەکان بکەن و سەر لە نوی هەلیان بخەلەتینن و لە شیخ مەحمود دوریان خەنەوە لە روژی ٢٤ کانونی دووەمی ١٩٢٢دا بەیانیکیان بە ناوی حکومەتی بەریتانیاو بە ناوی حکومەتی عیراقەوە دەرکرد کە لەوە پیشیش بە کورتی باسکراوەو وە ئیستاش هەموو بەیانەکە دەخەینە بەر چاوتان کە ئەلیت : ــ

«حکومەتی خاوەن شکوی بریتانیا وە حکومەتی عیراق دان ئەنین بە مافی تەواوەتی کورددا کە لە سنوری عیراقدا دادەنیشن بو دامەزراندنی حکومەتیکی

---

« ١ » یادداشتی رەفیق حلمی بەگ بەرگی شەشەم لاپەرە ــ ٤٣ ــ

کوردی لەو ناوچانەدا کە بە زوری کورد نشینن ، پیویستە کوردەکان خویان لە ناو خویانا ریك بکەون بە زوترین کات بو پیك هینانــی حکومەتەکەیان وە نوینەری رەسمی خویان بنیرن بو بەغداد بو دامەزراندنی پەیوەندی سیاسی و ئابوری لە گەل حکومەتی بەریتانیاو حکومەتی عیراقدا » •

شیخ مەحمود لەم کاتەدا خەریکی بلاو کردنەوەی دەسەلاتی خوی بو لە بەر ئەوە کە پروتوگولی ۳۰ نیسانی ۱۹۲۳ز گیرا حکومەتی بەریتانیا شاری سولەیمانی خستە ژیر چاودیری خویەوە جیاواز لە لواکانی تری عیراق ، شیخ مەحمود کە سەری لی شیوابو ئاگای لە هیچ نەبو لە روژی ۱۱ / ٦ / ۱۹۲۳دا گەرایەوە بو سولەیمانیو داگیری کردەوە ، لە بەر ئەوە ئەنجومەنی وەزیرانی عیراقی کوبونەوە بریاریاندا لە سەر دەرکردنی ئەم بریارانە هەمووی بو ئەوەی دلنیایی کوردەکان بکەن وە مەیلیان ببرن لە شیخ مەحمود •

۱ ــ حکومەت نایەویت مەئموری عەرەب تعین بکات لە شارەکانی کوردستاندا تەنیا مەئموری فەنی نەبی ، •

۲ ــ حکومەت زور لە دانیشتوانی کوردستان ناکات ، کە بە عەرەبی قسە بکەونو لە مصالحی رەسمیشدا بە کوردی معاملە بکەن •

۳ ــ هەموو کارو باریکی نەتەوایەتیو ئاینی هەموو دەپاریزریت •

لە دوای دەرکردنی ئەم بریارانە ئنجا سوپای عیراق وە هیزی هەوایی بەریتانیاو سوپایەکی بەکری گیراو لە ئاثوریەکان هیرشیان هینایە سەر شیخ مەحمود لە تەموزی ۱۹۲٤دا شاری سولەیمانیان داگیر کرد •

لەم کاتەدا زرنگەی زەنگیکی تر لە مەیداندا دەنگی دایەوە وە عنصریکی

تازەیشں هاتە مەیدانەوە ، تورکیای تازە دەستی کرد بە داوا کردنـی ولایەتـی موصل واتە « کوردستانی خوارو » کە ئەبوایە کومەلی نەتەوەکان پاشە روژی ئەم وولاتەی روون بکردایەوەو بیخستایە بەر چاو کە پرە لە « نەوت » لە بەر ئەوە دەستی کرد بە تەماشا کردنی ئەم بابەتە وە داوای کرد کە رەغبەتی دانیشتوانی ئەم وولاتـە وەربگیریـت •

لە روژی ١٣ تشرینی دووەمی ١٩٢٤زدا لیژنەیەك لە سێ پیاوی گـەورە پیك هات یەکیکیان « کونت تەلکی » هەنگاری بو ، دووەمیان « مسیو فاویرسن» سـویدی بو ، سێیەمیان « کولونیل پولیس » بەلچیکی بو ، ئەم لیژنەیە لـە روژی ١٦ی کانونی دووەمی ١٩٢٥زدا لە گەل ئەندامیکی تورك و ئەندامیکـی عـیراقیدا لە بەغـدادەوە چـون بو موصـل ، پاش تەحقیقـات گـەرانەوە بو ولاتی خویان و راپوریکیان دا بە ئەنجومەنی کومەلی نەتەوەکـان « عصـبە الامم » لە روژی ١٦ی تەموزی ١٩٢٥دا لە باسی کوردەکانا وتویانە : ـــ

« ئەبی داوا کاریەکانی کوردەکان بە نظری اعتبار وەربگیریت ، کە دەیانەوی مەئمورەکانیان هەموو کورد بن ، وە خویندەواری و زانیاری بە کوردی بیت ، وە وتویانە ئەبی زامنی تەواو بدریت بە کوردەکان وە ئیداراتی داخلی سەربەخویان یو یکریـت •

پاش چوار سال قبول کردنی « پەیمانی ئینگلیزی عیراقـی »و نەمانـی دەسەلاتی کومەلی نەتەوەکان لە سەر عیراق ، چونکە زور لە کوردەکان حـەز بەوە دەکەن کە بگیررینەوە ژیر دەسەلاتی تورکیا نەك لە ژیر ئیدارەی عیراقدا •

ئینگلیزەکان بو دەست خەرو کردنی کومەلی نەتەوەکان بە درو بەلینیاندا کە ئەم داوا کاریانەی نەتەوەی کورد هەمووی جیبەجی دەکەن ، لەو کاتـەدا لە

شاری سولەیمانی‌دا داوای حکومەتیکی کوردی سەربەخو کرا ، بەم جورە لە سەر راپوری « مجلس وسطی » بریار درا کە ولایەتی موصل واتە «کوردستانی خوارو » بخریتە سەر حکومەتی عیراق لە روژی ١٦ای تشرینی دووەمی ١٩٢٥زدا لە بەندی سی‌یەمی ئەم بریارەدا ئەلیت : ـــ

« حکومەتی بەریتانیا کە چاودیری کەری ئەم ولاتەیە ، ئەبی بە ئەنجومەنی کومەلی نەتەوەکان « عصبە الامم » رابگەیەنیت چ جورە تەدابیریکی وەرگرتوە لە بابەت ئەو بەلینانەوە کە لیژنە داوای کردبو بو کوردەکان » .

لە سەر ئەم داوا کردنە وەزیری مستعمراتی بەریتانیا لە روژی ٣ی ئەیلولی ١٩٢٦دا یادداشتیکی داوە بە ئەنجومەنی کومەلی نەتەوەکان « عصبە الامم » لە بەندی هەشتەمی ئەم یادداشتەدا اشارەتی ئەو ووتارەی کـردوە کە سـەرەك وەزیرانی عیراق بلاوی کردوتەوە لە روژی ٢١ کانونی دووەمی ١٩٢٦دا کەئەلیت:

« ئەو وولاتە ناژی ئەگەر مافی نەتەوایەتی کـوردەکان نەدریـت ئەبـی مەئمورەکانیان لە خویـان بن ، ئـەبی زبانەکەیـان رەسـمی بیـت ، ئەبـی لە قوتابخانەکانی حکومەتا فیری خویندن ببن بە کوردی ، وە ئەبی بە چاویکی یاشی تەماشای هەموو کەمایەتی‌یە نەتەوایەتیەکانی تریش بکریت » .

بەم جورە بەیانات و مەناشیری زور بە هەموو وەزارەتەکان وە شارەکانـدا بلاو کرایەوە ، وە هەروها مندوبی سامی بەریتانیاش وتاریکی بلاو کـردەوە ئەلیـت : ـــ

« هیچ جیاوازیەك نیە لە بەینی کوردو عەرەبدا » .

بەم دروو دەلەسانە کورد هەلخەلەتینراو لە خشتە برا ، حکومەتە سـاوا

نازداره خیر له خو نەدیوەکەی له ناو چو ، ئومیدی نەماو ئاسوی روناکی بە تاریکی گەرا ، شیخ مەحمودیش پاش ئەوەی سوپای عیراق و ئاثوری و هیزی هەوایی بەریتانیا له پینجوینیش تەنگیان پی هەلچنی که ئوزدەمیریش نەیتوانی لەم تەنگ و چەلەمەیە رزگاری کا ناچار چوە خاکی ئیرانەوە .

شیخ مەحمودی نەبەز گریی حکمداری و ملکی و سەندنی مافی نەتەوایەتی نەتەوەکەی له دلیا بوبو بە گری ، له مانگی حوزەیرانی ۱۹۳۰دا پەیمانی بەینی حکومەتی عیراق و بەریتانیا بلاو کرایەوە له بارەی پەیوەندی بەینی ئەم دوو دەولەتەوە له دوای ئەوەی که عیراق ئەبیت بە ئەندام له ئەنجومەنی کومەلی نەتەوەکان ـ عصبه الامم ـ داو سەربەخو ئەبیت ، ئەم پەیمانە بوە هوی بلاو بونەوەی ئاژاوەو هەرا بە ناو کوردەکاندا وە بوە هوی خوپیشاندانی گەورە له ناو شارەکاندا ، بە تایبەتی له شاری سولەیمانیدا که له روژی ٦ ی ئەیلولی ۱۹۳۰دا خوپیشاندان رویداو سوپای عیراق تەقەی له خو پیشاندەران کردو کوشتاریکی زوری لی کردن ئەم کردەوە نارەوایە شیخ مەحمودی داچلەکاندو خوینی دلسوزی و کوردایەتی و نیشتمان پەروەری هاتە جوش سەر له نوی هیرشی هیناو شورشی بەرپا کردەوە بو سەندنی تولەی خوینی ئەو شەهیدانەی له پیناوی رزگاری کوردستانا گیانیان بەخت کرد ، ئەم شورشەی شیخ مەحمود دیسان هەشت مانگی خایاند .

حکومەتی عیراق له سالی ۱۹۳۰دا که ویستی ببی بە ئەندام له کومەلی نەتەوەکان « عصبه الامم »دا بە ناچاری دیسانەوە کەوتەوە دلنیایی کوردەکان بویە « قانونی لغاتی محلی » بلاو کردەوە بو ئەوەی وا له ئەنجومەنی کومەلی

نەتەوە بگەیەنیت بیرو باوری زور چاکە بەرامبەر بە کوردەکان لە سالی ١٩٣٢دا کە عیراق بو بە ئەندام دیسان ئەم بەلینانەی تازە کردەوە بە بەیانیکی رەسمی کە هیزی دەستوری درایە وە وینەیەکی نیررا بو بارەگای « کومەلی نەتەوە »کان لە شیوەی بەلگە « وثیقە »یەکی رەسمیدا اعتباری پی کراو دانرا •

★★★

## هاتنی سمکو بو سولەیمانی :ـ

لەوە پیش بە کورتی باسیکی هاتنی سمکومان کردوە بو شاری سولەیمانی بو دیدەنی شیخ مەحمود ئیستا بە پیی یادداشتی رەشید جودت بەگ کە یەکیك بوە لەو لاوە نیشتمان پەروەرانە وە لەو ئەفسەرە دلیرانەی کاتی لاوی خوی لە ریی کوردایەتیدا بەخت کردوەو تەمەنی جوانی بردوتە سەر وە ماوەی دوو سالو نیو راویژ کەری سیاسیو سەربازی سمکو بوە وە بە تەواوی شارەزای هەمـوو کردەوەیەکی بوە ، وە هەروەها یادداشتەکەی ماموستا رەفیق حلمی کە بەلگەیەکی رەسمین بو ئەو کارەساتو روداوانە لەو کاتانەی پیشودا لە کوردستاندا لـەوە پیش رویـان داوە •

رەشید جودت ئەلیت : ـ « لە سالی ١٩٢٢دا لە سولەیمانی سوپاە سالار شیخ قادری حەفید برای شیخ مەحمود فەرمانی دا بە رەشید جودت کە خانوەکەی مالی باوکی ئامادە بکریت بو میوانداری ئیسماعیل خانی سمکو ، ئەو خـانوەە

بە جوریکی وا رازانرایەوە یشی بو میواندارى پیشـــەوایەکی وەك سمـــکو ،
پاش چەند روژیك سمکو هات ئەوەی بو ئەو کراوە وە ئەو پیشوازیەی ئـــەو
کە کراوە هیشتا لە میژووی شاری سولەیمانیدا بو کەس نەکراوە ، ســمکو
ماوەی سیّ مانگ لەسولەیمانی مایەوە ئەوەبو شیخ مەحمود لە گەل ئینگلیزەکانا
تیك چوبو وە بە تەواوی لە یەك ئاشکرا بوبون ئینگلیزەکان بەناننامەیان بو شیخ
مەحمود فریدایە خواری بە فروکە لە سولەیمانی داوایان لی کرد سولەیمانی بـــە
جیبیلیت ، وە هەروەها بەیاننامەشیان بو سمکو فریدا کە بروا چونکە بومبـــا
بارانی شاری سولەیمانی دەکەن نەك خوی‌و پیاوی تووشی زیان ببن ، سمکو
پاش ئەوە بریاری‌دا بگەریتەوە تکلیفی لە رەشید جودت کرد کە بچی لە گەلی
چونکە کەسی ئەو زور بی کەسەو راوێژکەری سەربازی‌و سیاسی نیە ، رەشید
جودەتیش لاویکی خوین گەرم‌و نیشتمان پەروەر بوو خوینی کوردایەتی هاتە
جوش چو لە گەلیا ، لە تشرینی دووەمی ١٩٢٢دا لە سولەیمانی دەرچون

سمکو لە پیش ئەوەدا بیت بو عیراق ئەفسەریکی ناپاکی تورك کە یەکیك
بو لە پیاوەکانی خوی بە دزیەوە هاتبو بو لای سمکو وە لە هیزو توانای سمکو
گەیشتبو وە زانی بوی سمکو لە خوی ئەمینە چوبو مەفرەزەیەك سەربازی تورکی
ئامادە کردبو وە لە بەری بەیانا دابوی بە سەر شوینەکەی سمکودا لە هەر چوار
لاوە دەوری گرتبو دابویە بەر لیژگەی گوللەو شەستیر ، خوشەویستترین ژنی
سمکو کوژرابو سمکوش خوی بە پەلە پروزکی دەرباز بوبو رای کردبو بو شاخ
لەو راکردنەدا بای ٥٠ تا ٦٠ هەزار لیرەی ئالتون مجەوهەرات‌و ٤٠ هەزار لیرەی
ئالتون پارەکە لە مالەکەیا بوی دەرنەچوو هەمویان بە تالان بـــرد خەســـرەوی

کوریشی بە دیل گیرا ، سمکو هەموو ئامانجی ئەوەبو کورەکەی لە دیلی رزگار بکا ، « قەدری بەگ »ی والی « وان » ئیسماعیل ئاغای زور خوش دەویست بەلینی دایە کە خەسرەوی کوری بو بگیریتەوە ، لەم کاتەدا لە ناوچەی «حەکاری» هەرایەك رویدا هیزیکی سەربازی لیوی لە عیراقەوە هیرشیان بردبوە سەر مەفرەزەیەکی تورك هەمویان گرتبون ، تورکەکان نیازیان وابو تولەیان لی بسیننەوە وە کەلك لە دەسەلاتداری‌و هیزی ئیسماعیل خانی سمکو وەرگرن ، سمکوش زور لە تورکەکان داخ لە دل بو لە خوای ئەویست ئیشیکی پی بسپیرن‌و چەکی بدەنی تا بەو هیزو چەکەی خویان تولەیان لی بسینن ، بەلام یە داخەوە ریك نەکەوت ، هەر لەو کاتەدا ئینگلیز لە گەل تورکەکانا ریك کەوت وە ئیسماعیل خانی سمکو ئەم ریکەوتنەی تورك‌و ئینگلیزی دانایە بەدبەختی بو خوی چونکە خوا یاریدەی نەدا کە تولەی خوی لە تورکەکان بسینی •

## سمکوو ئیران :ـ

لەو کاتەدا کە سمکو بە روالەت‌و سەر زاری لە گەل تورکەکان ریك کەوتبو ئیرانیەکانیش ئەیان ویست رای کیشن بەلای خویاندا ، «عبدالله خانی طهماسبی» کرابو بە والی « ئازربایجان » بە نامە خوی گەیاندە سمکو وە یەك دوو جار داوای لە سمکو کرد لە سەر سنور دیدەنی یەکتر بکەن ، وە داوای لە سمکو کرد کە بگەریتەوە شوینەکەی خوی ، سمکو چو بو سنوور وە یەکتریان دی ، زروف گوررا حکومەتی ئیران بە ناچاری دلی ئیسماعیل خانی دایەوەو دلنیایی کردو ئاشتی کردەوە ، ئیسماعیل خان گەرایەوە بو شوینەکەی خوی ، رەشید جودت ئەلیت‌ئیسماعیل‌خان زوردلیروچالاك‌و شیربوکوردیکی‌دلسوزبو زورجارئاموژگاری

برایانەی کردوە وتویەتی برام من دوو سال‌و نیوە لە گەل توم ئیستا نیازم وایە بگەریمەوە بویە ئاموژگاریت ئەکەم ، ئەمانەی لە دەورو پشتی تون زور کەمیان دلسوزن بو تو ، ئەبی زور ئاگاداری خوت بکەیت کە دەچیت بو دیدەنی لە گەل کاربەدەستانی ئیرانیدا چونکە ژیانت لە تەنگ‌و چەلەمەدایە وەك جعفر ئاغای برات ، ئەبی ئیشی خوت باشی بزانیت هەرگیز نەچیت بو دوائری حکومەت ،بە کردەوە گویی نەدایە ئاموژگاریەکان ، ئەم پیشەوا بە نرخە چو بو دیدەنی میری لەشکر لە شاری « شنو » بەو بیانوەوە کە میر هیشتا نەهاتوە پاش ماوەیەك دیت سەربازیکیان نارد بو لای سمکوو ئەم خەبەرەیان دایە ، سمکویان هیشتەوە بو سبەینی ، لە شوینی کوبونەوەکەدا هەموو بناکانیان پرکرد لە سەربازی پر چەك وە ئامادەیان کردن لە کاتیکا کە سمکو هات وە نزیك بووە بە خانوەکان لە هەموو لایەکەوە درایە بەر لیزگەی تفەنگ‌و کوژرا ، بەم شیوە پر لە نامەردیە سمکویان کوشت .

## سمکوو شیخ مەحمود :ـ

وەك ئینگلیزەکان چوبوە میشکیانەوە شیخ مەحمودو سمکو دوژمنی یەکتر نەبون ، بروسکەکانی بەینی سمکوو شیخ هیوای بە ئینگلیزەکان پەیدا کردبو ، لە بەر ئەوە ریگایان دا بە سمکو کە بیت بو دیدەنی سولەیمانی‌و شیخ مەحمود ، کە دەنگی هاتنی سمکو بلاو بوەوە بە شاری سولەیمانیدا شارەکە خروشا ، چونکە ناوبانگ‌و شورەتی سمکوو دلیری‌و قارەمانی ئەم پیشەوا کوردە بە هەموو کوردستاندا بلاو بویوە ، لە بەر ئەوە هاتنی بو سولەیمانی بو کیشەی

کورد یە مزگینی دەژمیرراو گولی هیوای سیس بوی نیشتمان پەروەرەکانی گەشاندەوە پیشەوا سمکو لە دلی هەموو کوردیکی دلسوزا شوینو جیگایەکی بەرزو بەریزی هەبو ، بە قارەمانیکی گەورەی نیشتمانی دەناسرا ، لە بەر ئەوە هاتنی لەو سەرو دەمەدا بو سولەیمانی شتیکی کەم نەبو ، ئەم هاتنە بوبوە ویردی سەر زبانی گەورەو بچوکو ، ژنو پیاو ، بی ئوقرە هەموو چاوبان لە ری بو بە پەروشەوە چاوەریی ئەم هاتنەیان دەکرد ، وە ئەیان ویست ساتیك زووتر بە دیداری شادبین ، ئەوانەی کوردو نیشتمان پەروەر بوون سمکویان بەقارەمانیکی نیشتمانی دانابو ، هیوای ئەوەیان لی دەکرد کە ئەم هاتنەی ببیتە هوی گورینی « باری سیاسی » وە لادانی شیخ مەحمود لە سەر ئەو ری‌یەی کە پیا دەرواو وەستاو ەلە سەری ، وە وەرگیرانی سەرنجی بە لای کوردایەتیو کوردستاندا ، هاتنی سمکو بو سولەیمانی نزیك بووە ، روژی هاتنی دانیشتوانی شارو دیهاتو دەورو پشتی وە خیلەکان هەموو چون بە پیریەوەو بە گەرمی پیشوازیان کرد ، شارەکە وەك بووك رازینرایەوە ، بوە شاییو ئاهەنگو بەزمبەم جورە پیشوازیەکی زور پر لە شانازی کرا ، ئەو کارەساتەی لەو روژەدا لە سولەیمانی کراوە مەگەر تەنیا لەو روژەدا کرابی کە شیخ مەحمود لە هندستان لە دیلی گەرایەوە ، تورکەکان کە ئەمەیان دی کەوتنە ترسەوە ، چونکە مصطفی پاشایان باش دەناسی بویە ناویان نابو « نەمرووود » وە لە کاتی خوشیا هەر بە بونەی ئەوەوەبو کە تورکەکان هەلیان کوتابوە سەر سمکوو ژنەکەیان کوشتو کورەکەیان بە دیل گرت ، چونکە مصطفی پاشا لەو کاتەدا لە سنورەکانی بەینی ئیرانو تورکا بو بو ئەوەشس چوبوە لای سمکو ، کە روی لە ئیران پی‌وەرگیریو ئاگری ئاژاوەی لە خاکی تورکا پی بنیتەوە ، تورکەکان سمکویان لە دەمیکەوە ناسیوە ، وە ئەیان

ڤانی که بو سەربەستیو سەربەخویی کورد خەریکەو خەبات ئەکاو هەرا دەنیتەوە تورکەکان لەو روژەدا گلابون بە شەری یونانەوە هیزو توانای ئەوەیان نەبو دەست بو سمکو دریژ بکەن وە سمکوش خەریکی ئیران بو نیازی ئەوەی نەبو

دەست بو تورکیا دریژ بکات ، بەلام چوونی مصطفی پاشا بو لای سمکو ئارامی لە تورکەکان بریو ترسیکی گەورەی خستنە دلەوە بویە ئەوەیان بە سمکو کرد کە کردیان ، جا بویە ئەمجارەش کە دیان مصطفی پاشا چوە بن دەست سمکووە تورکەکان دیسان ئارامیان لی برایەوەو مەترسیان کەوتە دلەوە ، لە بەر ئەوە « رەمزی »یە شەلو « فەوزی بەگ »ی یوزباشی چەند ئەفسەریکی تری ئوزدەمیر لە رەواندزەوە بە دزیەوە هاتن بو سولەیمانیو لە لای شیخ مەحمود دابەزین ، لەولاشەوە « فەتاح ئەفەندی » « ٢ » ژن برای شیخ مەحمود بە پەلە لە ریگای موصلەوە هاتەوە بو سولەیمانی لە سەر پیلانی « تایەری ئەمین ئەفەندی » وە عباس ئاغای مەحمود ئاغای پشدەری .

بە هاتنەوەی « فەتاح ئەفەندی » لە ریگای موصلەوەو دیدەنی شیخ مەحمودو گفتو گو کردن لە گەلیا بوە هوی بەهیز کردنی پەیوەندی بەینی شیخ مەحمودو تورکەکان ، سمکو زور رقی لە تورك بو چونکە برینی تازە بووە وە لە بەر ئەوە بوی بکرایە وە بە هیوای سەرکەوتن بوایە بە هەموو جوریك هەولی ئەدا تولەیان لی بسینیتەوە بەلام ئەمجارە باری سیاست بە جوریکی تر کەوتە بەر چاو ، چونکە پرو پاگەندەی ئوزدەمیرو دەستەو دایرەکەی زور بە تینو بە هیزو وەستایانە بو

« ١ » یادداشتی رەفیق حلمی بەرگی شەش .

سیاسەتی تورك لە بروزا بو ، دەرکەوت کە « تایەر » بەراستی دپلوماسیەکـی چەشنو بە تواناو قال بو بە پشوو پیلان گیرە ، چونکە توانی سیاسەتی ئینگلیز بگلینی ، وە هەروەها کاربەدەستە ئینگلیزەکانیش سەربازو کەللە رەق بوون ، نەشارەزایی دپلوماسیەتیان بەوەدا دەرکەوت کە « تایەر » گلاندنی •

★★★

## حکمـداری شـیخ مەحمـودو نوزدەمـیر :ـ

ئەو کاتەی شیخ مەحمود گەیشتە سولەیمانی « میجەر نوئیل » بە نـاوی حاکمی گشتی بەریتانیاوە لە کوبونەوەیەکدا لە بەر دەرگای سەرای سولەیمانیدا بەیانی « حکمداری » شیخ مەحمودی بلاو کردەوە « ئوزدەمیر »١ »لە روژی ١ / ١١ / ٣٣٨ رومیدا بە ژمارە « ٥٦ » راپوریکی بە پەلەی نارد بو قوماندانی جەبهەی خورهەلات « الجزیرە »بەهوی فرقەی هەشتەوە ئەلیت : ـ

١ ـ لە ئەمارەتی شیخ مەحمودا وە لە ژیر چاودیری ئینگلیزەکان حکومەتیکی کوردستانی بە رەسمی بلاو کرایەوە ، هیئەتی حکومەت پیك هـاتوە لەمانـەی خـــوارەوە : ـ

باشی قوماندان « سوپاه سـالار » شیخ قادر حفیـد
سەروکـی داخلیـە « نـاوەوە » شـیخ محمـد غریـب
سـەروکی « دارایـی » عبدالکریـم عەلەکە

« ١ » یادداشـتی رەفیـق حلمـی بەرگـی شـەش •

ســەروکی معارف « زانســتی » مصطفــی نەمرود « مصطفی پاشا »
ســەروکی شــەرع و عــدل « دادپەرستی » مونحــەل
ســەروکی ریــژی « گومــرگ »ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ صاحبقران
ســەروکی اشــغال « کارگــوزاری » محمد ئاغای عبدالرحمن ئاغا
ئەمنیــەی عمــومی « ئاسایشــس » ســید ئەحمــەد بەرزنجی
سەروکی عمومی کوردستان « مفتشی عمومی کوردستان » صــدیق القــادری

٢ـ بوتی گەیشتن لەبیرو باوری شیخ مەحمود وەچونە بنجو بناوانی مەبەست و کانگای دلیەوە ، فەوزی بەگی یوزباشی ، کە یەکیکە لەو ئەفسەرانەی لە ژیــر دەستمان ، خوی گوریی و چوە سولەیمانی ، بەلام جاری نەگەراوەتەوە .

٣ ـ مصطفی « نەمرود » لە روژنامەی کوردستاندا دەربارەی حکومەتــی تورك ووتاری زور خراپ بلاو ئەکاتەوە ، « میجەر نوئیل » وە « مــەولانا زادە رفعت » و گەلی ئەفسەری تر ی بەغدادی گەیشتونەتە سولەیمانی .

٤ شکی تیا نیە کە « سید طە »و « سمکو »ش ناســرەون و بی دەنگ نــین وە تیکەل بە جولانەوەی «کویە »و « رانیە »و « دەربەند » ئەبن .

قائمقــامو ئــوزدەمیر

## ژەبونــی وولاتــی تــورك :ــ

قوماندانی جەبهەی روژهەلات « بەسری بەگ »ناو سەرەکی ئەرکانیجەنگ بە موری خوی ئەم نامەیەی ناردوە بو « ئوزدەمیر » لە رەواندز ، ئەویش لــە « ژیر پەیمانی ژمارە ــ ٩ ــ »دا لە یادداشتەکەیا نوسیویەتی : ــ

لە دیار بەکرەوە بو ئوزدەمیر بەگ قائممقام : ــ

١٤ / ٦ / ٣٣٨ رومی    استخبارات ژمارە ١٧٤٥

١ ــ سمکو کابرایەکی فیلبازە ، بەهوی زرنگی خویەوە ئەو خەنجەرە کــە هەلیگرتووە بو کاتی خوی ئەیشارینەوە • ئەم پیاوە بیری سەربەخویی «استقلال» لە میشکدایە ، مەبەستی ئەوەیە تا لە ئیراندا دەسەلاتی زیاد ئەکاو بەهیز ئەبیــت لە گەل ئیمە تیك نەچیتو بەم جورە بە مەرامو ئامانج بگات ٠

٢ ــ سەرکەوتنی سمکو لە ناو عەشایەری کورداو بەم جورە گەورە بونیو دەسەلات پەیدا کردنی بو « حکومەتی میللی » ئیمە دەست نادات ، بەلام لــەم روژەدا تیك چونمان لە گەل سمکو بو ئیمەش باش نیە ، ئەگەر بتوانن‌و هەولی ئەوە بدەن کە بە پرو پاگاندە بلاو کردنەوەیەکی وا کە عەشایەری پی تەفرە بخوا بیان کەن بە دوژمنی سمکو بە راستی بەم کردەوەیە خزمەتی گەورەی حکومەت ئەکەن ، وەك ئەوە کە بلین سمکو بە پارەی ئینگلیز ئەم شورشە ئەگیریو بــو قازانجی خوییو خزمەتی ئینگلیز خوینی کوردەکان ئەرژینــی •

٣ ــ ئەو مەفرەزەیە کە لیرەوە خراوەتە ری جاری ئەچیتە « چولە میرگ »دوای گەیشتنی ئیوە بە رەواندزو جی گیر بوتنان لەوی ، بە پیی هەوال‌و پیویســت فەرمانی تر ئەدریت بە بزوتنەوەی مەفرەزەکەو هاتنی وە یانەهاتنی بو رەواندز ،

٤ ــ هیزی گویزەرەوەمان نیە کە توپەو مەترەلیوزی پیا بنیرین هەول ئەدەین کە ئەوەشتان بو جی‌بە جی بکەین .

بــە نــاوی قوماندانــی جەبهــەوە
سەروك ئەرکانی جەنــگ
بەســـری

ئەم نامەیەی جواد پاشای سەرکردەی لەشکری جــەبهەی الجزیــرە لــە خوارەوە ئەنووسین ، بو ئەوەی هیزو توانای ئەو وەختەی تورك باش دەربکەوی لە چ رادەیەکا بوە کە کوردە بەسزمانە ساویلکەکان بوی خەلەتاونو خویان بو داون بە کوشت .

لە روژی ۷ تەموزی ۳۳۸ رومی‌دا بە ژمارە ۱۰۸٤ جواد پاشــا وەلامــی نامەیەکی ئوزدەمیر ئەداتەوە ئەلیت : ــ

« لە بابەت چەکەوە کە داواتان کردوە قول ئوردوی نوهەم ئەلیت ــ ۲۰۰ ــ تفەنگی سندوقدار بە ــ ۷۰ ــ سندق جبە خانەوە لە گەل ــ ۱۲٦ ــ تفەنگــی تریشی بە ــ ۳٤ ــ سندوق فیشەکەوە نیررا بو « باشقەلا » لەوە زیاتر نیە ، لە بابەت زیاد کردنی هیزەوە بە هیچ جوریك لە توانامانا نیە ، وە هوی گوازتنەوەمان نیە توپ بنیرین ، وەستایەکمان بو ناردن بو چاك کردنەوەی توپە شکاوەکەتان ،

ئەمە بو هەموو هیزو توانای ئوزدەمیر ، بەلام پرو پاگاندەی زور بەهیزو دەزگایەکی ریكو پیکی پرو پاگاندەی هەبو بە چاوو راو خوی کردبو بە حاکمی

---

« ۱ » یادداشــتی رەفیــق حلمــی بەرگــی شــەشی .

سەربەخو لە رەواندزدا ، وە هەرەشەی داگـیر کردنی هـەموو شارەکانـی کوردستانی دەکرد • ئەمەش لە بەر ئەوەبو زوریـەی کوردەکـان باوریـان بە ئینگلیز نەمابـو •

ئوزدەمیر هەستی بە زەبونی خوی کردبو ، وە بیری لەوە کـردبووە کـە روژیك کوردەکان هەست بەم درووەلەسەو زەبونیەی بکەن چی لی ئەکـەن ؟ لە بەر ئەوە بە پەلە نامەیەك دەنوسیت بو قوماندانی جەبهە داوای هیز ئـەکات چونکە لەو سەربازانەی لە گەلی بوون ــ ۲۰ ــ سەربازی جەزایری یاخی بونو رایـان کـردبو •

لە روژی ۱۲ / ۷ / ۳۳۸ رومیدا بـە ژمارە ــ ۲۱ ــ ئەم نامەیـەی بـو قوماندانی جەبهەی الجزیرە نووسیو ئەلیت :ــ

راکردنی سەربازە جەزایریەکان ئیمەی خستـە هەلویستیکی گرنگـەوە ، ئیتر ئەوانەی بو ئینگلیز هەول ئەدەنو پرو پاگاندە ئەکەن ری‌یان بو کرایـەوە ، تا خەتەکانی تەلگرافیشیان لی برین ، بەهوی کرینی ولاخی بەرزەوە لە سنووردا دەست نەکەوتنی هیوای‌ریکخستنی هوی گوازتنەوەشمان نەما ، وەنوینەرەکانمان بە دەستی بەتال گەرانەوە ، «بابکری سەلیم ئاغا»و «شیخ محمد بالەك»هەندیك لە پیاوەکانی « سمکو »ش زور بەربەرەکانیمان ئەکـەن وە بو سەرکەوتنـی ئینگلیزەکان هەول ئەدەن ، ئینگلیزەکانیش بە باوەش روپیە بلاو دەکەنـەوە ئنجا ئوزدەمیر لە نامەکەیا زور ئەپارتەوە داوای ناردنی هیزی تازە ئەکا وەداوای مەفرەزەکەی « چولە میرگ » ئەکا بو رەواندز •

ئوزدەمیر زور سەرکردەیەکی « رومانتیکی » خەیالی بووە بەم نامەیـەی

خواروەیدا دەر دەکەوی کە چەند خەیالی بوە ، زوریشی لە خوی بایی بوە تا رادی « گومرایی »بەو چوار نەفەرە رەش‌و رووت‌و شرەوە بی چەك‌و پەریشان سەودای شەر کردنی لە دوو جەبهەوە کەوتبوە کەللەوە وای دەزانی هەموو شوینەکانی تریشی پرە لە جل خوار وەك شاری سولەیمانی وە لە شوینەکانی تریشا « تایەر »و « ئەحمەد تەقی »یەکی تری دەست دەکەوی ، ئەی‌ویست لە لایەکەوە شارەکانی « عەقرەو عمادیەو دهوك‌وزاخو» وەلەلای تریشەوە «رانیەو دەربەندو مەعمورو کویەو سولەیمانی‌و تا کفری » داگیر بکا ، لە نامەکەیا کە بە روژی ۸ / ۸ / ۳۸ رومی‌دا بە ژمارە « ۲۹ » « ۱ » ئوزدەمیر نووسیویتی بو جەودەت پاشائەلیت « ئەمەوی ئاژاوە بگەیەنمە هەریمی « دیالی » بەم جورە خیلە‌عەرەبەکان کە بە دوستی تورك ناسراون تیکەل بە شورش گیرانی « ۱ » کوردیان بکەم وە ناوچەی هیزو بارەگام بگویزمەوە بو قەلای « دووین » لە « بابە جیجك » واتە « بی‌بی جەك » مەبەستی بەرو دوای ئوزدمیر لەم خەیالە ئەوەبو کە ناوچەی هەولیر بخاتە ژیر مەترسیەوە ، چونکە لەو روژەدا بوبو بە مەلبەندی کوبونەوەی هیزی ئینگلیز ، وە بەهوی « میرانی قادر بەگ »یشەوە کە بە سەرزار هاو پەیمانی تورکەکان بو ببیتە هوی هاندان‌و راست کردنەوەی خیلی « خوشناو »و گرتنی « شەقلاوە » •

---

« ۱ » یادداشتی رەفیق حلمی بەرگی شەشی •

« ۲ » مەفرەزەکەی ئوزدەمیرئازوقەی خویان پی تامین نەدەکرا بەسەر دانیشتوانی ناوچەی رەواندزەوە دەژیان کەچی ئەم فیزەشیان هەبو — نووسەر —

ئوزدەمیر لە خەیالی خویدا بەم جورە پیلانی هیرشی بردنی دانا لەم ناوچانەدا شیخی بارزان عەمادیە داگیر بکات ، فارس ئاغا بدا بە سەر عەقرەدا ، عبدالقادر مەزوری وە رەشید بەرواری وە شیخ رەقیب وەشیخ عبید لەناوچەکانا هەلبورین‌و خەریکی کارو باری لەشکر بن ، شیخ کاکە ئەمین وە ئەحمەد بەگی قائممقام وە نوری بەگی قوماندانی ژەندرمە وە میرانی قادر بەگ بچنە سەر « رانیەو دەربەندو کویەو پشدەرو سولەیمانی » ، پشدەری‌و مەنگورو هەمەوەندەکان هیرش بەرنە سەر «محمد ئاغای بالەکیان » ئەگەر هات‌و « دهوك»یش داگیر کرا ئەوا خەتی « زاخو » ئەبریت •

ئا ی‌لەم خەیال پلاوەی ئوزدەمیر پاشای تورك ، بە سی چل نەفەری رەش‌و روتی پی خاوسی لە برسا مردوی تورکەوە خەیالی چون دەکاتەو ، بەلام رەغنە لە ئوزدەمیر ناگرین رەغنە لە پیاوە گەورەکانی کوردە گرین ، ئەلیین « ئافەریـــن بو سەروك خیلەکان‌و پیاوە گەورەکانی کورد چون ئەوەندە لە دوا بوون باوریان بەم پیاوە فیلبازە ئاژاوە نیرەوەیە کردوەو دوای کەوتون‌و خویان‌و کوردی بـــو ئەدەن بە کوشت ! » •

لە روژی ٥ی ئەیلولی ١٩٢٢دا ئینگلیزەکان لە سولەیمانی هەموو چونــە ناو فروکەوەو شاری سولەیمانیان چول کرد ، بەریوەبەری کارو باری شارەکەیان دایە دەست شیخ قادری حەفید برای شیخ مەحمود لە گەل چەند کەسیکی تردا کە بون بە کومەلیك وە ئەم کومەلە ناو نرا « ئەنجومەنی نەتەوایەتی » بوپاراستنی شاری سولەیمانی‌و دەورو پشتی لە خراپەو ئاژاوەو پیـــاو خراپان ئەنجـــومەنی

ناو براو لەم پیاوانە پیك هـات : ـ

١ ـ شیخ قادری حفید برای شیخ مەحمود « ١ »

٢ ـ حاجی مصطفی پاشا یاملکی

٣ ـ حەمە ئاغای عبدالرحمن ئاغا

٤ ـ عبـدالفتاح چلبـی

٥ ـ مجید ئەفەندی حاجی رسول ئاغا

٦ ـ ئەحمەد بەگی توفیق بـەگ

ئوزدمیر چاوەڕیی هاتنەوەی شیخ مەحمودی نەکرد نامەیەکی بە پـەلەی نارد بو « شیخ قادر حفید » لە روژی ١٥ / ٩ / ٣٣٨رومی‌دا بە ناوی وثیقـە ژمارە ـ ١٨ ـەوە لە بەندی « ٥ »ی نامەکەیا ئەلیت : ـ

« شیخ قادر ! ئەبی باش بزانن ٠ ٠ ٠ بستی جی لەو خاکانەی کە لەپەیمانی نەتەوەیی‌ماندا دانراوە لە ژیر چنگی بیگانەدا نابی بمینیتەوە ، ئنجا من بو ئەوە هاتمە کوردستان کە ئەم حەقیقەتە لە برا خوشەویستەکانـی سـەر بە ئیمـەو هاو پەیمانەکانمان بگەیەنم تا وەکو کوردەکانی برای دینـیو « ١ » دوستـی دیرینمان نەبنە قوربانی سیاسەتی ئینگلیزە ناپاکەکان ، وە بە هاندانـی ئەوان کوسپو تەگەرە نەهیننە ریگەمان ٠ ٠ ٠ » ٠

---

« ١ » بزانە چون وە بە چ ووشەیەك دماری کوردە بە سزمانەکان دەگرن لـە کاتی تەنگانەدا برای دینی کوردن ، لە کاتی خوشیا ئەیان کوژنو لە نا یـان ئەبـەن

ـ نووسـەر ـ

« ١ » چـ دی شورشەکانی شیخ مەحمودی مەزن ـ احمد خواجە ـ لاپەرە٩٦

« ٢ » یادداشتی رەفیـق حلمـی بەرگـی شـەشـ لاپەرە ٦٥

لە بەر ئەوەی کە سەرپاکی ولایەتی موصل خراوەتە « پەیمانی نەتەوەیی » تورکەوە هیزیکی ناپاکی وابە بیرا نایەتکە بتوانی وەلە ناوسنورە نەتەوەیی‌یەکانی ئیمەدا فەرمان رەوایی بکا ، تا ئەمرو لەشکرە گەورەکانی تورك لە جەبهەکانی ترا خەریکی لەشکرەکانی دوژمن بوون وە نەیان ئەپەرژایە سەر ئەم هەریمانە ، ئەوا بە یارمەتی یەزدان جەبهەکانی خور ئاوا پاك کرانەوە لە دوژمن ، لە بەر ئەوە لەم سەعاتوە دەست ئەکەین بە پاك کردنەوەی ئەم هەریمەو پشت بە خوا زوری پی ناچی لە گەل دوژمندا هەرچی ناپاکیك هەیە لە ناوچەکانی کوردستاندا ئەکرینە دەرەوە « ٢ » • • • » •

نامەکە زور دورو دریژە بەندی حەوتەمی پیویستە بزانریت چونکە پەیوەندی هەیە بە کیشەی کوردەوە ئەوا ئەینووسین ، ئەلیت : ــ

دوای وەستاندنی شەری گەورە شیخ مەحمود باش لە سیاسەتی‌ئینگلیزە مەلعونە ناپاکەکان گەیشتو دلیرانە بەربەرەکانی کردنو وەستا بەرامبەریان وغەزای لە گەل کردن ، بەلی لە ئەنجاما گیراو تووشی ئازارو زیانی زور بو بویە ئیمەش بە رزگار بونی لە دیلی گەلیك دلشادین وە زورمان پی خوشە کە بگەریتەوە بو سولەیمانی ، وە ببیتەوە بە سەروکی حکومەتی ئەم ناوچەیە ، بەلام نەك وا تی‌گەیشتبین کە بەخشندەی بەم سەروکایەتی‌یە ئینگلیزەکانو سەر لە ئاستیانا بچەمیننەوە وە لەو باوەرەشا نین کە شیخ مەحمود ببی بە سەروکیکی وا کە تەفرو تونای موسلمانەکانی لە دوبیو ببی بەهوی بەد ناوی بوی ، ئیوەش کە هەر لەو درەختە پیروزەن بە بیرمانا نایەت بە دەسیسەی « نەمرود » مانای « مصطفی پاشا »و هاو بیرەکانی تەفرە بخونو شوین بیرو باوری ئەم مەلعونە بکەون ، جا بو ئەوەی کە کوتایی بە دوو بەرەکیەتی خەلکی سولەیمانی بدریت

وە دوو دڵیو دوو زمانی لە ناوا نەمینی وە لە لای تریشەوە بو ئەوە کە بە ناوی حکومەتی ئیمەوە « مانای بەناوی حکومەتی تورکەوە »هەلسوراندنیکارو باری هەریمی سولەیمانی بخاتە ژیر حوکمی ئیوەوە وە هەر جورە رابەریو یارمەتیەك پیویستە بیکا وە بە هەموو جوریك یارمەتیان بدات بە سەروکایەتی « فەوزی بەگ »ی « ١ » یوزباشیدا مەفرەزەیەك سەربازم نارد بو سولەیمانی هیوا دارم پیشوازیان بکەن وە بە گەیشتنیان هەول بدەن تەشکیلاتیکی تازە بکـەن لـە پیاوە بەناموسەکانی لای خوتان » •

« ١ » لە سـولەیمانی بو دامەزراندنی ئەنجومەنی نەتەوە لە بناکەی مکتەبـی اعدادی کە مکتبی فیصلیە بو وە ئیستا بازاری عصریە لەوی کوبونەوەیەك رویدا لەو کوبونەوەیەدا چل خوارەکان داوای ژیانی مصطفی کمالو تورکیان دەکرد لە بر یەکیك وتی « تورك هات » چونکە دەنگی هاتنی مەفرەزەکە بلاو بـوبووە ، ئیتـر کوبونەوەکە نەماو چول کرا « کەریم بەگی فەتاح بـەگ» یهـەمەوەند مصطفـی پاشای گرتو خستیە بەندیخانەوە بو ئەوەی کە تورکەکان هاتـن بیکا بە دیـاری دەستی خویو بیداتە دەستیان ، ئەوانیش بە دیاری بینـیرن بو مصـطفی کـمال بیکا بە قەنارەدا ، بەلام کومەلەی کوردستان فریای کەوتنو رزگاریان کرد •

یادداشتی رەفیق حلمی بەگ بەرگی شەشی لاپەرە « ٦٧ » •

## فەوزی بەگو شێخ مەحمود : ـ

ئۆزدەمیر بە راسپاردەو بو گفتو گو کردن فەوزی بەگ دەنیریت بولای شیخ مەحمود پاش گفتو گو کردنو دیدەنی فەوزی بەگ نامەیەك دەنیریت بو ئوزدەمیر ئەلیـت : ـ

« لەوەلامیکی یەکیك لە پرسیارەکانی شیخ مەحمودا ووتم « مەبەسمان لە جولانەوەیە ئەوەیە کە هەر هەریمیك خرابیتە ناو سنورەکانی پەیمانی نەتەوەیی‌یەو بیگیرنەوە ، جا ئەمرو کە ئیتر لە شەرەکانی جەبهەی خور ئاوادا سەرکەوتین بو ئەوە تیدەکوشین کە تا سەر سنورەکانی « جبل حمرین » ئەو جیگایانە هەمـو داگیر بکەین کە بە وولاتی تورك دەژمیریتو لە دەستوری نەتەوەیی تورکـ پیشاندراوە ، ئەوەشم تی گەیاند کە ئەم بریارەمان لەوانە نیە بگورریت ! » •

### قسەکانی شیخ مەحمود لە گەل فەوزی بەگ « ١ » : ـ

فەوزی بەگ ئەلیت شیخ مەحمود پیی ووتم « من موسولمانم ، دەولـەتی عوسمانیم خوش ئەوی ، ئەو سزاو جەورو جەفایەی ئینگلیز بە منی کرد هەرگیز لە بیرم ناچیتەوە ، من لە کاتیکا چوم بەگژ ئینگلیزدا کە زوربەی هیزەکانی لـە عیراقدابو ، بەلام عەشایەری کورد کە لە پیشا سەرپاکیان سویند خواری من‌بوو وە شەریان بو کردم لە دواییدا لیم تەکینەوە لە مەیدانی شەردا بە تاقی تەنیا لە کوری جەنگا مامەوە ، بوون بەهوی ئەوە کە سالها لە وولاتی بیگانەدا دەردی

« ١ » یادداشـتی رەفیـق حلمـی بەرگـی شـەش •

دیلی بچیژم ، له بەر ئەوه ئەبی ئەوه زور باش بزانن پشت به عەشایەر نایەستریت. وه به هیزی عەشایەرەوه ئاژاوه نانەوه ئەنجامیکی باشی لی چاوەری ناکریت ، به تایبەتی هەراو ئاژاوەیەك كه تەنیاپال پشتی هیزی عەشایەر بیت ، وەمەبەستیکی نەتەوایەتیو نیشتمان پەروەری هانی نەداو هیزیکی دەولەتی پشتگری نەكا ، هەرگیز سەری نەگرتوەو سەریشی ناگریت ، ئنجا شیخ مەحمود بو نمونه باسی شەری « دەربەند »ی کرد وتویەتی : ـ

بەناموسترین سەروکی ئەو عەشایەرانه كه له گەل ئیوەدا بوونو گوللەیان ئەنا به سەر سنگی ئینگلیزەوه ئەمرو مووچه خورن لای « میجەر نوئیـل » وه ئیستا ئالو گوری نامه هەیه له بەینیاندا به نهینی ، وه به سەر زاریشی ئیسـتا خویان به دوستی ئیوه ئەدەنه قەلەمو واتان ئەبەنه میشکەوه كه ئـامادەن بـو یارمەتیتان ، بویه ئەبی بزانن لەم وولاتەدا تەنیا دوستایەتی بەس نیـه ، هیـزو پارەش پیویسته كه هیزو پاره بو ئەگەیت به ئامانج ، ئیمه هەرچەند هیزەکەشمان کەم بیت بەلام شتی زورما ن پی دەکریت ، چونکه وولاتەکەمان له چەند حاکمیك بەولاوه ئینگلیزی تیا نیه ، ئەوەی ئەمرو پیویسته چاو ترساندنی چەند سەرەك عەشیرەتیکی سەر به ئینگلیزه ، هیزیکی بچوکی دەولەتیش پیویسته كه ئاسایشی ناو شارەکانی پی بپاریزریت ، وه ئەوانه نەهیلین كه له کاتی بومبا باراندا هەلیان دەست دەکەوت له شارەکاندا خراپەیان دەکرد »ئەمه بوون قسەکانی شیخمەحمود به راستی زور پر ماناو به تیبینی بوه له قسه کردندا .

شیخ مەحمود دیسان به فەوزی بەگی ووتوه « ئینگلیزەکان کەرکـوكو هەولیرو عەقرەو هەموو ئەو شوینانەی کورد زبانن له ولایەتی موصلدا دەخەینه

سەر کوردستان بەومەرجەی منیش داوای رەواندزتان لیبکەم‌وە یان لەخوتانەوە یوم چول بکەن » •

شیخ مەحمود بو ئەوەی فەوزی بەگ دانەچلەکیت‌و نیی نەسلەمیتەوە وە بو ئەوەی لە بیرو باوری تەواوی ئوزدەمیریش بگات‌و تاقی یکاتەوە ووتـی :ـ « لە بەر ئەوەی کە بە ناوی باور پیکراویکەوە بو تیگەیشتن لە بیرو باوری من هاتون ، لام وایە کە ئەم قسانەم بی کەم‌و زیاد بگەیەنن بە ئوزدەمیر وە گەورەکانی تورك چونکە من ئەزانم کە ئینگلیزەکان لە بەلینەکانیانا راست نین وە لە بابەت سەربەخویی کوردستانەوە هەر پەیمانیکیان داوە هەمـوی دروو دەلەسەیـەو تەفرەیان ئەدەن‌و مەبەستی بەرو دوایان ئەوەیە کە دوژمنایەتـی بخەنە بەینـی کوردو تورکەوەو بمان کەن بە گژ یەکا ، لە بەر ئەوە من بەرامبەر بەم بەلـین‌و پەیمانانەی ئەوان نامەوی بە ئاشکرا کوسپیان بینمە ری‌و سەرپیچی بکەم کەم‌و زور تابتوانم تەفرەیان ئەدەم‌و کاتیان پیئەبەمە سەر ، تائیوە بریاریك ئەدەن وە ری‌و شوینیکی پوختەو تایبەتیم بو دیاری ئەکەن‌و ئاگادارم ئەکەن ، ئەوەی منیش لە ئیوەم ئەوی کە بە زوترین کات بیکەن چوار شتە : ـ

١ ـ ئەگەر هیزتان هەیەو لە تواناتاندا هەیە کە شارەکانی سولەیمانی‌و کەرکوك تا سنوری « جبل حمرین » بگرن ئەوا بەبی وەستان وەرن بو سەر سولەیمانی ئەوسایە منیش مصطفی نەمروودو ئەوانەی هاو بیرو باوری ئـەون هەمویـان ئەگرم‌و بە گەیشتنتان بو ئیرە لە گەل شارەکەدا بە دەستی بەستراو ئەیاندەمـە دەستتان ، دوای ئەوەش خوم لە گەل ئیوە یان بەو هیزەوە کە خوم هەمەو بـە دەستمەوەیە تا « جبل حمرین » هەموو شارەکانی ترتان بو دەگرم •

٢ ـ ئەگەر هیزیکی واشتان نیە کە ئەم کارە بباتە سەر وە تەنیا لە من ئەوەتان پیویستە کە خزمەتی دوژمنتان نەکەم وە یا مەبەستان ئەوەیە کە دوستی‌و یەکیەتی‌و فداکاری خومتان بو دەرخەم ، ئامادەم ئیستا بەم شەوە بە مال‌و منالەوە سولەیمانی بە جی بیلیم وە بو هەر جیگایەك حکومەتی تورك بیەویت وە بوم دابنیت بچم‌و لەوی جی نشین بیم •

٣ ـ هات‌و حکومەتی تورك ئەمەشی بە باش نەزانی ویستی لە بوونی مـن لەم وولاتەدا بە جوریکی تر کەلك وەرگریت ، ئامادەم کە بە دل‌و گیان خزمەتتان بکەم بەو مەرجەی کە ئەگەر بە هیزیکی دەولەتیش نەتوانن بە چەك‌و تفاقـی جەنگی زور بریاری یارمەتیم بدەن ، وە بەو مەرجەی لەو چەکانەدا « توپ »یشی تیا بی وە ئەبی ئەفسەری بە هیزو بەکاریان لە گەلا بیت وە ئەبی ئەو ئەفسەرانەش بە سەر زاری دلیان لە دەولەتی تورك رەنجا بیت وە پەنایـان هینـابی بو نـاو کوردەکان ، ئەو کاتە منیش بە هەموو هەستیکمەوە بە سوپای کوردەوە دەست ئەکەم بە شەرو جولانەوە بو داگیر کردنی ئەوشوینانەی‌لە بەرنامەی شورشەکەمانا بیت ، من لە خوبەخت کردن لانادەم هیوام هەیە بتوانـم بە ئامانجـی خوتـان بگەیەنم • « ١ » •

٤ ـ ئەگەر هات‌و ئەم داوا کردنانەی سەرەوە هیچی بە باش نەزانراو کردنیان لە توانانانا نەبو وە یا ئەو هیزە شك نابەن کە سولەیمانی پی بگرن وە ئاسایشی ئەم هەریمەی پی رابگرن وە نە لەو هەلویستەشدان کە بتوانن بەو چـەك‌و تفاقـە جەنگیانەش چەکدارمان بکەن کە بو ئەم کارە پی‌ویستە بە مەرجی کە خوتـان بە باشی بزانن‌و باورم پی بکەن ئەلیم : ـ

---

« ١ » یادداشـتی رەفیـق حلمـی بەرگـی شـەش •

« جاری ئەم هیزە کەمو ناتەواوەتان بکیشنەوە دواوە بو ناو تورکیا ،لەو لای تریشەوە تا ئەتوانن خیراو بە گورجی هیزی ترو تفاقی جەنگی تری بخەنە تەك ، تا ئەگاتە رادەیەك دەست بدا بو بزوتنەوەیەکی بە راستیو داوەشاندنی چەپوکیکی زلو بەتین ، تا ئیوەش ئەمانە جیبەجی ئەکەنو خوتان ئامادە دەکەن بو بزوتنەوە ، منیش لیرە لە گەل ئینگلیزەکاندا! بە سەر زاری ریك دەکەوم ، بەشی خوم چەکو تفاقی جەنگو پارەشیان لیئەسینم ، بو ئەوە کە لە کاتیکا هیزەکانی ئیوە لە سەرەوە گلیر بونەوە خواری ، منیش بە خومو هیزمەوە راست ئەبمەوەو بەو چەکانە کە لە خویانم وەرگرتوە ئەکەومە ویزەیانو ئەیاندەمە بەر چەپوك » .

## سیاسەتی ئوزدەمیر بەرامبەر بە کورد :ـ

ئوزدەمیر وەك هەموو سەرکردەکانی تورك بە چاویکی دلسوزانەو بەریز تەماشای کوردی نەدەکرد ، بە تایبەتی پیشەواکانی کورد وەك « شیخ مەحمود سمکو » وە موتمانەی پی نەدەکردن ، وە لە دلا باوری پییان نەبو ، بەلام لە روالەتدا وەك پیشەواکانی تری تورکی نەدەکرد وە تا رادەیەك خوی ئەگرت وە رقو بوغزو کینەی خوی ئەپەچنیە دلیو ئەیخواردەوەو پیشی ئەخواردەوە بو ئەوە هەولی ئەدا ئەوانەی بە تەواوی نەکەوتونەتە داوی ئینگلیزەوە هیچ نەبی یا جاری دور بنو نەکەون ، هەولی ئەدا ئەمانە لە خوی نزیك بکاتەوەو بیانکا

یه ئامیریك به دەست خویەوە تا بن بە درك لە سەر ریی سیاسەتی ئینگلیزدا لە کوردستاندا بو سەر شیواندن لە سیاسەتی ئینگلیز ، هەموو هەولو تـەقەلای ئەوەبو شیخ مەحمودی لە دەست دەرنەچیت ، بە گەیشتنی شیخ مەحمود بـو سولەیمانی ، پەیتا پەیتا یەك لە دوای یەك زوو ئەفسەرەکانی خوی ئەنارده لای و نامەو نووسراوی رازاوەو جوانی دلخوشکەرەی هەل خەلەتینەری بو دەناردو دەماری کوردایەتی و مسولمانیەتی دەبزواند ، تا گەیشتە رادەیەکی وا کەموتمانەی کردبو کە شیخ مەحمود کەمی تورکەکان بە زور زوری ئینگلیزەکان ناگوریتەوە وە بوشی دەرکەوت کە بەو جورەو بەو گەرمیەی کە ئەو سەری کردبوە سـەر شیخ مەحمود ، ئینگلیزەکان وا سەریان نەکردبوە سەری وە رەنجیان لە گـەل نەئەدا ، بویە بەم بونەیەوە کەوتە ناردن و وەرگرتنی نامە لە گەل گەورەکانی خویا لە « دیار بەکر » وە ئەو داواکاریەی شیخ مەحمودی گەیاندبو بە حکومەتـی تورکیا ، بەلام گەورەکانی تورك باش نەهاتن بە دەنـگ ئوزدەمـیرەوە بویـە دەرکەوت کە لە کردەوەکانی ئوزدەمیر رازی نەبون وە نەشیان ئەویست نائومیدی بکەن ، وە هەروەها نیازی ئەوەشیان نەبو کە هیچ جورە مافیك بدەن بە کورد لە بەر ئەوە زور یە پیچ و پەنا لە گەلی دەجولانەوە ، ئوزدەمیریش زور وریـاو شەیتان بو خوی نەئەشکاند بەرامبەر بە شیخ محمودو کوردەکان لە ئەندازەی پیچ و پەنای گەورەکانی خویا کە لە گەلیاندا دەکرد ، ئەویش بە فشـەو هاژەو فەنبازی سەرنەکەوتنی خوی ئەشاردەوە ، سەرەرای ئەمەشـی « کومەلیکـی نهینی » « ١ » کە لە کەرکوکدا پیك هاتبو بو بلاو کـردنەوەی بـیرو بـاوری

« ١ » یادداشتی رەفیق حلمی بەك لە بەرگی شەشی لاپەرە « ٧٨ »دا ئەلیت :ـ ئەم کومەلە نهینیە کومەلی «کرکوك مدافعه حقوقی جمعیتی » مانای «کومەلی

« تورکمان »یەتی ، هەولی ئەدا بو بلاو بونەوەی بیرو باوری تورکایەتی ، خوی بەستبو بە ئوزدەمیرەوە ئـەم کومەلـە لـەم کاتـەدا کـە شـیخ مەحمـود گەرابووە بو سولەیمانیو بزوتنەوەیەکی بەهیزی کوردایەتی دەستی پیکردەوە ئەمان داچلەکینو کەوتنە مەترسی ، ئەیان ویست لەوە بگەن کە ئوزدەمیر بـیرو باوری چییە بەرامبەر بە گەرانەوەی شیخ مەحمودو کیشەی کورد ، بویە لـەم روەوە بە نامە ناردن ئوزدەمیریان تەنگە تاو کرد ، نامەیەکی نهینییان بو ناردبو ئەویش ناچار بو وەلامی دانەوە ، بە نامەیەکـی نهینـی ژمارە ٤٢ لـە روژی ٢٣ / ١١ / ٣٣٨رومیدا ئەلیـت : ـ

١ ـ بەندی یەکەمی نامە نهینیەکەتان وەلامی نیە •

ـ ٢ بە بونەی داپوشینی ریگاکان بە بەفر ، بروسکەو نامەو شفرەی نهینـی کە لە یەینی ئیمەو جەبهەدا ئالو گور دەکرا ئەمرو بە تەتەری تایبەتیا دەنیرریـت وە وەلامیشی دیتەوە ، لە بەر ئەوە کیشەی موصل چیی بە سەر هاتوە هیشـتا لە ئیمەشەوە مەعلوم نیە لە گەل ئەمەشدا ئەتوانین بلیین کە جەبهەی الجزیرە بـو ئەوەی کە لە کاتی پیویستا بکەویتە جولانەوەو چ کاریکی پی بسپیرریت بە جیی نهینیو مشووری خواردوەو خوی ئامادە کردوە ، وە لە کاتی جولانەوەدیـارەە بە فروکە ئاگادارم ئەکەن ، منیش دەست بەجی دەنگ لە کومەل دەگیرمەوە •

ـ ٣ تا ئیمرو لەشکرەکانمان چاوەریی کونگەرەی ئاشتیو ئەنجامەکانی بون ، بیتو موصل بە ئاشتی نەدریتەوە بە ئیمە پشت بە خوا بە جەنگ ئەیگیرینەوە •

---

بەرگری مافی کەرکوک » لەو کەسانە پیک هاتبو کـە خـویان بە تـورک دەزانـی : بەشیکیشیان کوردبون کە بودەست کەوتی شخصی خویانلایەنی تورکەکانیان گرتوە هەویان بە سەرکەوتنی دەکرد .

٤ ــ ئینگلیزەکان بە هیوای فشس کــردنەوەی داوا کاریەکانــی نوینەرانــی تورکن ، بە تەمان لە کیشەی موصلدا بیری پرسینەوەیەکی گشتی بخەنە بەر چاو لە بەر ئەوە لە کوردستانی خــواروودا خــەریکی دامەزراندنــی حکومەتیکــی سەربەخون ، بو ئەوەی بەم جورە ژمارەی کورد لە ژمارەی تورك زیاتر پیشان بدەن ، واتە نیازیان وایە لە بەر کەمی ژمارە مافی تورك بە سەر موصلەوە نەیەلن ، وە ئەندامانی کونگەرەی ئاشتی بە سەربەخوی کوردستان وە بەشی زوربــەی دانیشتوانی ولایەتی موصل کە کوردن تەفرە بدەنو تورکیان لە بیر بــەرنەوە ، شیخ مەحمودیشس کە تا ئەم روژانە لە گەل ئیمە بوە وە لە راستیو دوستایەتــی بەرامبەر بە تورك دوا نەکەوتوە هەندی « بی نیشتمانی » « ١ » خەلکی سولەیمانی خەریکن تەفرەی بدەنو بیخەنە سەر بیرو بــاوری دوژمنایەتی لە گەل تــورك ، ئەمەش بەوەدا دەر دەکەوی کە لەم دواییەدا بە بیانوی ئەوەوە کە ئینگلیزەکــان سەربەخویی تەواو « استقلال تام » ئەدەن بە کوردستان بە قسە بو دەمکــوت کردنی کوردەکانو نیشتمان پەروەرەکان شــیخ مــەحمودیش داوای نیــوە سەربەخوییەك لە ئیمە ئەکا لە بناغە دامەزراندنــی « ئەنجومەنی نــەتەوەیی » حکومەتی تورکا یاسایەك « قانون » نیە کە ناوی شایەتیو حکمداریەتی تیابــی ، ە بەر ئەوە بە شیوەیەکی دل خاوینانە شیخ مەحمود چون وە لە بەر چــی لەداوا کردنی ئەم جورە ناوو ناز ناوانەدا پیمان لی دادەگریت ؟ تی ناگەم بوچی ؟ .

لە بەر ئەوەی نامانەوی دەست لە شیخ مەحمــود بدەین وە بی‌شــکینین ەرامبەر بەوانەی کە هەولی دور خستنەوەی ئەدەن لە ئیمە ، داوای ئەوەم لی‌کرد کە لە لایەن خویەوە « باور پی‌کراو » بنیریت بو « ئەنقەرە » بو گفتو گوکردنە ە بارەی کیشەی کوردستانەوە ، وە بو ئەو تەشکیلاتە کە لەوانەیە لە ســنوری

قانونی ئەساسی‌دا حکومەتی تورك بو ئەم ولاتە بریاری لە سەر بدات ، وە تـا
ئەو روژەی لە ئەنقەرەوە بەهوی نوینەرە باور پی کراوەکانتەوە وەلامـی داوا
کردنەکانت دیتەوە لە کوردستاندا لە ژیر سەروکایەتی خـوتا هەیئەتـی « ۱ »
نوینەرانی نەتەوە دابمەزرینیت بو بەریوە بردنی کارو باری ولاتەکە •

لە سالی۱۹۱۸دائینگلیز کەگەیشتەخانەقین‌و کفری‌لەسولەیمانی ریکخراویکی
نەتەوەیی بە ناوی جمعیتی نهینی کوردەوە لە سلیمانی پیك هاتوە لە عزت توپچی
وە احمد بەگی توفیق بەگ‌و فایق توفیق محامی مدیری طاپو ، لەو کاتە کە ئینگلیز
گەیشتە کفری شیخ مەحمود عزت‌و فایقی توفیقی ناردوە بو دیـدەنیان لـەوی
ئینگلیزەکان ناردویانن بو بەغداد ، ئەمان داوای استقلالی کوردستانیان کردوە ،
وەلامی ئەوانیش ئەوەبو کە بچن اتصال لە گەل ملك حسین بکەن « ۱ » •

## ملکیـەتی شـیخ مەحمـود :ـ

اتصالی شیخ مەحمود زور لەو وەختەدا بە طاهر محمد افندی وطاهری امین
افندی‌و حسین ناظم‌و حمە رشید جوامیری هەمەوەندو کاکە حمەی امین عطـارو
حاجی سید حسن مامی شیخ مەحمودو عزت طوپچی کە نوینەری ئەفسەرەکان بوە
لە کاتیکا کە داوا لە شیخ مەحمود کراوە حوکمرانی کوردستان قبول بکا
ئەویشـ ئـەم جەماعەتـەی کـوکردوتـەوەو وە پرسـی پی‌کـردون

---

« ۱ » یادداشتی رەفیق حلمی بەرگی شەشەم لاپەرە « ۸۲ »دا ئەلیت :ـ
ئوزدەمیر لە نامە نهینیە کە ناردی بو کومەلی نهینی کەرکوك وینەیەکیشی بـە
یوزباشی فەوزی بەگ‌و رەمزی بەگی قائممقام‌و ئەحمە تەقی‌دا نارد بو شیخ مەحمود

ئیسراریان له شیخ مەحمود کردوه که ملکی قبول بکا ، بەلام حاجی سید حسنی مامی اسراری کردوه که نەیکا وتویەتی ایمه نازانین مەبەستو مەرامی اینگلیز چی‌یەو چی ئەکا بویه اگر تو قبولت کردو سەری نەگرت عەیبه بو ئیمه ، بەلام عزت زور سور بوه له سەر قبول کردنی •

له وەختیکا که میجەر نوئیل چو بو کوردستانی ژورو وه میجەر سون خەریکی هاتن بو بو سولەیمانی وەك باسکرا ، له سولەیمانی مدیری گومرگ ئینگلیزیك بو که ئەویش یەکیك بو له پیاوه سیاسیەکانی ئینگلیز هاته لای شیخ مەحمود داوای لی کرد که پیکەوه بچن بو گەران چونکه وەرز بەهار بو شیخ مەحمودیش چو له گەلیا بەرەو بەکره جو ، رویشتن لەوی ئینگلیزەکەبە شیخ مەحمودی ووتوه تکایه با پیاوەکان له دوور بوەستن ، ئنجا وتویەتی ئەم جوگه گەورەیه هی کی‌یه ؟ شیخیش وتویەتی هی حکومەته ، ئەویش وتویەتی ئەمەوی شتیکت به ناوی حکومەتی بەریتانیاوه عەرز بکەم ئەویش ئەوەیه که تو استقاله بکەیت له حکمرانی ئیمه بەلینت ادەینی ئەو معاشی مانگانەیەی که هەته که « ١٥ » هەزار روپیەیه بتدەینیوهەموو جوگاوئەرزو زەوی‌میریشت بدەینی تائینگلیزلەم ولاتەدا بیت بیخوو احترامیشت زور بی ، تا میجەر سون نەهاتوه چونکه تعلیماتی توندی دراوەتی وه خوشی زور توندو تیژه بویه زور ئارەزو ئەکەم وه به ناوی حکومەتی بەریتانیاوه عەرزت ئەکەم استقاله بکەیت باشه •

پاش ئەوه شیخ مەحمود ئەگەریتەوه حاجی سید حسنو جمعیتی کوردی کوکردوتەوەو ئەم موضوعەی بو گیرانەوەو رای پرسیون ، له وەلاما سی فکرەی جیاوازیان بوه : ـ

جماعەتیکیان وتویانه استقاله بکەو ئەو بەلینانـەی داویانـه وەك زەوی‌و زارو معاش قبولی مەکە،بچورە مالی خوت دابنیشە،جماعەتی دووەم ووتویانه استقاله بکەو معاش‌و بەلینەکانیان قبول بکە •

جماعەتی سێ‌یەم کە عزت یەکیکیان بوە ووتویەتی استقالە مەکە چی ئەبی با ببی ، چونکەئەگەر استقالەت کردمانای ئەوەیە هەرچیمان کردوە بودەست کەوتی خومان کردومانه ، شیخ مەحمود رای عزتی قبول کردوە • شیخ مەحمود لە گەل کومەلی ئەفسەرانا ریك بوە تەنیا لە گەل رضا بەگ‌و رشید بکر افندی نەبیت ، میجەر سون کە هاتە سولەیمانی منعی ئەفسەرەکانـی کرد بچـن بە لای شیـخ مەحمودا یەکیك لەو ئەفسەرانە « صدقی فاتە شەل »یان پی دەوت میجر سـون نقلی کرد بو هەلەبجە وە ایعازی دا بە علی بەگی ریشین کە بیکوژیت ئەویشـ لە بەر خیوەتەکەی خویا کوشتی ، ئنجا کاپتان لیس لە کتیبەکەیا ئەلیت : ـــ

کە صدقی نقل کرا لە سلیمانیەوە بو هەلەبجە نەمزانی صدقی زور خطـرە بو من نیازی وابو کە حەرەکەتی شیخ مەحمود دەست پی بکا من بگری‌و بمداتە دەست محمود خانی دزلی ، بەلام علی بەگی ریشین نەجاتی دام‌و کوشتی •

شیخ محمود لە پیشی هاتنی ئینگلیزدا لە ١٩١٨دا تـورکەکان گـرتیان‌و خستیانە بەندیخانەوە وە بردیان بو کەرکوك ، ئەم گرتنەش لە سەر ئەوەبو کە جمعیەتیکی نهینی لە سولەیمانی دروست بوە بە سەروکایەتی شیخ مەحمـود وە ئەندامیەتی : عزت طوپچی کە بەناو بانگە بە عزەتی فاتەی خولـە دریژو فایـق توفیق محامی کە فایقی طاپوی پی دەلین وە احمد بەگی توفیق بەگی طابور اغاسی لەو کاتەشا رشانەوە « هیضە » لە ئیراندا پەیدا دەبیت یەعنی لە ١٩١١زدا روسەکان نزیك « ١٠٠ » کەسیك بە ناوی پاراستنی تەندروستی « صحە »وە دەنیرن بـو

ایرانو بو عیراق وه زور لەمانە دکتور نەبون بەلکو پیاوی سیاسی بون بەو ناوەوە نیرراون ، شیخ مەحمود بە ناوی کومەلی نهینی‌یەوە « سید محمد مفتی »دەنیریت بو دیدەنی ئەم روسانە لە قونسولخانەی روسیاوە لەم دیدەنیەدا توفیق وەهبی هودەبی بو ئەوەی گفتو گویان لە گەل بکا ، بەلام لە ئەنجامی گفتو گودا ناگەنە نەتیجە ، ئنجا ئینگلیزەکان لە ۱۹۱۷دا دەگەنە بەغداد ، دیسان شیخ مەحمود سید محمدی مفتی دەنیریتەوە بو بەغداد وە نامە دەنیری بو ئینگلیزەکان بەم بونەیەوە مخابەرە لە بەینی شیخ مەحمودو ئینگلیزەکاندا دەست یی دەکات ، ئینگلیزەکان گەیشتنە خانەقین‌و کفری ئنجا محامی فایق توفیق دەچیت بو دیدەنیان ، ئینگلیزەکان کە هاتون بو کەرکوك شیخ مەحمود عبدالله اغای حاجی حمە سعیدی بە نوینەری خوی ناردوە بو کەرکوك بو اتصال بە ئینگلیزەکانەوە .

لەکەرکوك ماوەتەوە وە لە مالی مجید یعقوبی میوان بوە وە مجید یعقوبی اخباری تورکەکانی کردوە بەم حادثەیە لە بەر ئەوە تورکەکان شیخ مەحمودو احمد بەگی توفیق بەگ‌و عزت طوپچی‌و فایق طاپویان گرتوەو لەو کاتەشا ئینگلیزەکان کەرکوکیان چول کردبو تورکەکان گەرابونەوە ناو کەرکوك بویە ئەم بەندیانە بران بو کرکوك و شیخ مەحمود دەبەن بو دیدەنی قائدی تورك « علی احسان پاشا لەوی علی احسان وا پەسەند دەکا کە کەلك لە بونی شیخ مەحمود وەرگریت بویە سزای نادات بەلام داوای لی ئەکا کە ببی بە حاکمی ناوچەی سولەیمانی وە بچی بە گژ ئینگلیزدا ، شیخ کە گەرایەوە لە لای علی احسان پاشا پارەی نەبو قەرزدار بو « ٥ » هەزار لیرەی ئالتونی لە علی احسان پاشا وەرگرت شیخ مەحمود کە گەرایەوە بو سولەیمانی بو بە حاکم ، بەلام موەك لەوە پیشی باسکرا علی احسان تەلگرافیکی بو لیدا بو سولەیمانی بو

تاییدی قسەکان کە کردبویان ، پیکەوە بەلام شــیخ مەحمــود چونکــە زور ئەزیتی دیبو لە دەست تورك وە خوشی دەماری کوردایەتیو نەتەوایەتی تیا بــو گویی نەدایە داوا کردنەکانی علی احسان پاشاو تورك •

پاش ماوەیەك میجەر نوئیل وەك لەوە پیش باسکرا بەخویو مەفرەزەیەکەوە هات بو سولەیمانی ئەمری درابویە کە مسوولی ئەوناوچەیە بیت بەلام لەئەمرەکەدا دەلیت هەرچی اجرائاتو ریکخراویك ئەم حاکمە سەربازیانەی ئینگلیز دەیکەن لەم وەختەدا هەمووی وەختیەو لە پاشە روژا ئەتوانری هەل بوەشینریتەوە « ١ » •

لە کاتی حکمرانی شیخ مەحمودا کە شیخ زانی حکــمرانیەکەی تەنیا بــو سولەیمانییە داوای کرد شوینەکانی تری کوردستانی بخریتە پال لە بەر ئــەوە شیخ حاجی سید حسنی مامی لە گەل سید عبداللەی کوری حاجی سید حسن نارد بو کەرکوك بو دیدەنی سید احمدی خانقاەو داوای کرد کە بەشداری بکەن لەم حکمرانیەدا کەچی سید احمد رەفزی کرد وە بەشداری حکمرانیەکەی شیخ مەحمــودی نەکــــرد •

★★★

« ١ » ماناى ئەمەیە ئینگلیز بە راستی بریاری نەداوەو دانی نەناوە بەو حکمرانیە کە درابو بە شیخ مەحمود لە ناوچەی سولەیمانیداو بەس وە ئەوەش وەختی بو
ـ نو ســـەر

## پەریشـانی خیـزانی شـیخ مەحمـود :ـ

پاش گرتنی شیخ مەحمودو ناردنی بە دیلی بو هندستان ، خیزانەکەی لە نیوه شەودا رایان کرد ، عایشە خانی ژنی شیخ مەحمود لە گـەل جەماعەتیکـا رویان کردە دیی « کانی شیلان » وە بهیە خانی ژنی شیخو منالەکانیش گەیشتن لەویشەوە رویان کـردە « قەلای مەریـوان » ، انجا چـون بو « دزلـی » وە جەماعەتیکیان چونە دیی « درزیـان » ٠

شـیخ قـادری بـرای شـیخ مەحمـود لـە گـەل حەپسـە خـانو سەلمـە خـان رویـان کردبـوه « بـانە » بـەم جـورە ئـەم خیزانە بە ایراندا بلاو بونەوە ، جماعەتی پشدەریەکان لە گەل عباس اغا چوبون بـو سـەز دەشـت ٠

ئینگلیزەکان لە گەل حاکمی سەربازی « سنە »دا ناردیان بە دوای محمود خانی دزلیو محمود خانی کانی سانانیدا هەردوکیان گرتنو تەسلیم بە ئینگلیزیان کردن ئەوانیش محمود خانی دزلیان نارد بو هندستانو محمـود خانی کانـی سانانیان لە بەغداد حەپس کرد ٠ ئیتر خیزانی شیخ جیگایان پی لیـژ بو رویـان کردە ناوچەی « سقز » لە دیی « زەمبیل » مانەوە شیخ قادریش میوانی روستەم خان بو لە بەر ئەوە حاکمی سنە ناردی روستەم خانیان گرت وە اعدامیان کرد ، بویە ئەم خیزانە ناچار بوون کە روبکەنە ناوچەی « نهری » لە شمدینان لـەوی هەموو چونە لای اسماعیل خانی سمکو لە « چاریە » بو ئـەوەی لە مەترسـی رزگار بنو کەوتنە ژیر دالەی اسماعیل خـانەوە ، انجا لەویشەوە چـون بـو « رضائیە » لە پاشا لە ئیرانەوە رویان کردە سنوری تورکیا بەو زستانە بەفـرو سـەرماو سولەیە زور ئەزیتیان کیشا ، تا خـزمان لە سولەیمانیەوە هاتن بـو

لایانو به رەسمی بەیانی عفو کردنیان بو بردن که « میجەر سون » عفوی کردبون که بگەرینەوە ، ئەوانیشس هەموو به پەریشانی گەرانەوە ، •

جا لیرەدا نەمویست به دورو دریژی لەم دەربەدەریه بدویم بەلام به راستی زور وشی دەردە سەریو چەرمە سەریو ئەشکەنجە هاتن که مروف ناتوانی ئەو بارە گرانه هەلگریت ئەم خیزانه لیقەوماوە نەبیت •

پاشن گرتنی شیخ مەحمود وه ناردنی به دیلی بو هندستان ، دائـرەی مندوبی سامی ئەم نامەیەیان نارد بو مجلسی وزرا • :ـ

الی سکرتیر مجلس الوزراء : في ٢٢ شباط ١٩٢٢ الرقم ٤ / ٣٣٣٠ •

امرني فخامه المندوب السامی ان اخاطبکم بشأن أمـور لواء السـليمانيه الاداريه ، لا يخفى على مجلس الوزراء ان معاهده الصلح مع تركيا تنص علـى عدم معارضه دول الحلفاء الکبری اذا ارادت المناطق الكرديه التابعه للواء الموصل الانضمام الى حکومه کردستان في خلال سنه واحده من تأريخ عقـد الصلح مـع ترکيا ويعترف فخامه المندوب السامی المصالح الاقتصاديه وسواها التی تربط لواء السليمانيه بالعراق وعليه يظهر لفخامته امکان القيام بما عليه نحو الامه الكرديـه من جهه والحکومه الوطنيه من جهه اخری ، وذلك بتاليف اداره في لواء السليمانيه حالا يديردفتها فخامته بمشوره وزراء بدلا من الصوره المتبعه الان ای اداره دفه الامور من قبل هيئه الوزاره بمشوره فخامه المندوب السامی ، اما هـذه الاداره فستکون موقته ينظر فيها بعد مده المصرح بها في معاهده الصلح ، ثـم ان سـير برسی کوکس يتبع سياسه من شانها تأييد الحکم الذاتی وقد باشر فعلا في تقليل عدد المأمورين البريطانيين والهنود وتعيين قائممقامين وطنيين ويفکر فخامته ايضا

في تعيين متصرف للواء السليمانيه وان السياسه في العراق والسليمانيه مع كونهـا سياسه موحده الغرض والمرمى يجب ان تكون مراجعات متصرف السليمانيه مع المندوب السامى رأسا •

مجلسى وزراش وەلامى مندوبىساميان دايەوه وەك له خـوارەوه بـه عەرەبـى نووسـراوه : ــ

تلى كتاب من سكرتاريه فخامه المندوب السامى المرقم ٤ / ٣٣٣٠ والمورخ في ٢٢ شباط ١٩٢٠ متعلق بشوون اداره لواء السليمانيه ، فقرر مجلس الـوزراء بالاتفـاق ما يلـي : ــ

١ ــ بناء على اهميه موقع السليمانيه الجغرافى والروابط الاقتصاديه والسياسيه التى تربط با لعراق والتقاليد المشتركه القديمه يقترح مجلس الوزراء على فخامه المندوب السامى ابقاء القديم على قدمه وتوحيد اداره العراق واللـواء المذكـور واعتباره كسائر الويه العراق بجميع شوونه •

٢ ــ قرر مجلس الوزراء عرض البيان المرفوع من وزاره الدفاع الوطنـى مع الرجاء من فخامته ان تعرض محتويات البيان المذكور على المراجع البريطانيه المختصه وتطلب مساعدتهم محافظه عن حقوق العراق وجعل حدوده الشماليه على صورة تكفل صيانه البلاد من الطوارى الخارجيه كما هو مبين في الخارطه هـ ••

بدلا من ان تكون مع الوزراء ، ففخامه المندوب السامى يود الوقوف والحاله هذه على رأى مجلس الوزراء بهذا الخصوص ولعل هذه الخطه تحوز قبـولا منهـم • أ • هـ

له سالى ١٩٢٧دا دائرەى مندوبى سامى بريتانيا له عيراق له راپوريـكىدا به « ئەنجومەنى نەتەوەكان » « عصبه الامم » دەربارەى كورد ئەليت : ــ

وکیلی شیخ‌مه‌حمود سیداحمد به‌رزنجی له‌١٩٢٧دا له‌بغداد گفت‌وگوی کرد له‌گه‌ڵ حکومه‌تی عیراقدا له باره‌ی ریکه‌وتنی شیخ مه‌حموده‌وه له ناوه‌راستی مانگی کانونی دووه‌می ١٩٢٧دا سید احمد ئه‌و شروتانه‌ي امزا کرد که داوا کرابو له شیخ مه‌حمود ، ئه‌م شروتانه وه‌کیلی شیخ مه‌حمود سید احمد ناو بردی بو شیخ مه‌حمود بو امزا کردنی ئه‌ویشس وه‌لامی مندوبی سامی داوه‌ته‌وه داوای له مندوب السامی به‌ریتانیا کردوه که ناوچه‌ی « پینجوین »و ده‌ورو پشتی بده‌نی له ژیر ده‌سه‌لاتیا بیت ، به‌لام مندوب السامی موافقتی نه‌کردوه وه شیخ مه‌حمود سور بوه له سه‌ر داوا کردنه‌که‌ی خوی چونکه خوی له ناوچه‌ی پینجوین‌دا بو له به‌ر ئه‌وه حکومه‌ت هیزیکی گه‌وره‌ی ناردە سه‌ر شیخ مه‌حمود له روژی ٢٣ی نیسانی ١٩١٧دا دوای شه‌ریکی خوینین شیخ مه‌حمود به‌رگری پی نه‌کرا ناچار بو شه‌رته‌کانی قبول کردو به أمزا کراوی ناردەوه ، وه خوشی داوای کرد که ریگای بده‌نی بچی بو بغداد بو دیده‌نی مندوبی سامی ، موافقه‌ت له سه‌ر چونی کرا له روژی ٥ تموزی ١٩٢٧دا چو بو دیده‌نی مندوبی سامی سکالای له‌وه کرد که‌بوچی له ئیران دانیشی ، مندوبی سامی له وه‌لاما ووتی له بغداد یان له موصل دانیشه ، شیخیش له به‌ر ئه‌وه‌ی باوری پی‌یان نه‌بو گه‌رایه‌وه بو شوینه‌که‌ی خوی له ئیران له « پیران »

ئه‌و شه‌رتانه‌ی له شیخ مه‌حمود داوا کرابو : ـ

١ ـ شیخ مه‌حمود ئه‌بی له سنووری عیراق بچیته ده‌ره‌وه له ئیران جی نشین ببی‌و نه‌یه‌ته ناو سنووری عیراقه‌وه •

٢ ـ کوریك له کوره‌کانی بنیریت بو به‌غداد بو خویندن « ١ » •

---

١ مه‌به‌ستی به‌ریتانیا له ناردنی کوریك له کوره‌کانی شیخ مه‌حمود بو به‌غداد بو خویندن فیربونی ئه‌و کوره‌ی نه‌بووه ، به‌لکو ناردنی ئه‌م کوره بو ئه‌وه یوه که شیخ مه‌حمود بترسینن که ئیتر نه‌زویته‌وه چونکه کوره‌که‌ی بارمته‌یه . ـ نووسه‌ر ـ

٣ ــ وەکیلیك دابنی بو سەرپەرشتی کردنی ملكو دیهاتەکانی کە حکومەت داویەتیەوەو دەستی لە سەر لابردوە •

شیخ مەحمود « بابا علی » کوری نارد بو بەغداد بو خویندن •

پاش ئەوە لەروژی ٦ی‌ایلولی ١٩٣٠دا لەسولەیمانی بزوتنەوەیەکی سیاسی گەورە دەست پی کراو خوپیشاندانیك کرا بو مەنعی هەلبژاردنی نوینەرانی ئەنجومەنی نوینەران حکومەت هیزیکی هینا بو دامرکاندنەوەی هیرشی کوردەکان تەقەی لی کردن وە کوشتاریکی زوری لە کوردە بی چەکەکان کرد ، شیخ مەحمود کە ئەمەی بیست سەر لە نوی راست بووە وە لە بغدادیشەوە ئەفسەر محمود جودت وحمید جودت وکامل حسن چون التحاقیان بە شیخ مەحمودەوە کرد لە گەل شاعر شیخ سلام احمددا •

انجا شیخ مەحمود بە لەشکرەوە هاتە ناو سنووری عیراقەوە ، وە هوشیار نامەیەکی رەسمی نارد بو مندوبی سامی عیراق ووتی : ــ

پیویستە حکومەتی عیراق لە کوردستاندا نەمینی هەر لە خانەقینەوە تا زاخو لە ماوەیەکی کەمدا ، •

لە سەر ئەمە حکومەتی عیراق بەیانیکی رەسمی دەرکرد ئەلیت : ــ

لە بەر ئەوەی کە شیخ مەحمود لە بەلینەکانی خوی کە داویەتی پاشگەز بوتەوە هاتوتەوە ناو سنوری عیراقەوەو یاخی بوە بویە بریار درا هیرشیکی گەورەی بکریتە سەر ، حکومەت فەوجی یەکەمی نارد بو پینجوین وە فەوجی دووەمی نارد بو شارباژیر وە سوپای ئاثوریو لیویو پولیسی نارد لە گەل شیخ

مەحمودا بو شەریکی توند ، ئنجا حکومەتی عیراق أعلانی حوکمی عورفی کرد بو لوای سولەیمانیدا ، پاش شەریکی گەورە شیخ دەرەقەت نەهات لە روژی ١٣ی مایسی ١٩٣١دا شیخ مەحمود خوی دا بە دەستەوەو گیرا بە دیلی بردیان بو ناصریەو سماوەو لەویشەوە بو « عنه » پاش ماوەیەك هینایان لە بغداد دایان‌نا ، هەروا محمود جودەت‌و حمید جودەتیش خویان دا بە دەستەوەو خرانە بەندیخانەوە ، پاش ماوەیەك عفو کران •

## مندوبی سامی چارەنووسی عیراق دادەنیت : ـ

دانانی چارەنوسی عیراق لە لایەن بەریتانیاوە : ـ

لە « تأریخ العراق السیاسی الحدیث » بەرگی یەك نووسینی عبدالرزاق الحسنی لە لاپەرە ١٠٣و ١٠٤دا دەری خستوە ئەلیت : ـ

ویلسن هەول ئەدا چارە نووسی عیراق دامەزرینیت •

مونتاکو وەزیری هند تەنیا بەو بروسکەیە رازی نەبو کە لی‌یدابو بو ویلسن لە عیراق بەلکو داوای لی‌کرد کە بچی بو پاریس بو ئەوەی نزیك بیت لە کونگەرەی ئاشتی لە روژی ٢٥ی شباط ١٩١٩دا ویلسن چو بو پاریس لە روژی ٢٠ی اذار ١٩١٩دا گەیشتە پاریس لەوی لە گەل سیاسیەکانی ئینگلیزو فرەنسەدا دوا وە چو بو دیدەنی « شای بەریتانیا جورجی پینجەم » لە لندن لە روژی ١٤ی نیسان ١٩١٩دا لەوی کە باسی چارە نووسی عیراق هاتە پیشەوە پیشنیاریکی دا ئەلیت : ـ

١ ــ میری عەرەب نابی ببی ، بەلکو ئەبی مندوبی سامی ببی •

٢ ــ وولاتی موصلو دیرالزور بخریتە سەر عراق لە گەل ناوچەکانی کوردستان، کە ئیستا بەشیکە لە ولایەتی موصل ، کە ئەم بەشە داخلی سنووری حکومەتـی ئەرمەنی چاوەری کراو ناکریت ، کە ئەم ناوچەیەش پیك هاتووە لە دوو بـەری زابی گەورە بە تەواوی ، ئەمەش زور پیویستە بو ئەوەی ئاثوریەکانی بخریتەپال

★★★

## سەد هەزار روپیە بەخشیش بو ئەو کەسەی شیخ مەحمود بکوژی :ــ

مندوبی سامی عیراق بە نووسینی ژمارە ١٢٢ لە روژی ٨ حزیرانی ١٩٢٥دا داوا لە مجلسی وزرای عیراق ئەکا کە جائزە دابنین بو ئەو کەسانەی ئـەتوانن شیخ مەحمودو کریم بەگی فتاح بەگو صابیری کوری بکوژن ئـەوانەی کـە هەلدەستن بەم ئیشە « سەد هەزار روپیە لە حکومـەت وەرگـرنو داوا دەکـا ئەوانەی کە هەلدەستن بەم ئیشە نابی لە سوپای لیوی بـن » •

## نووسینی روژنامه عەرەبیەکان لە بارەی شورشەکانی شیخ مەحمـــودەوە : ـ (( ۱ ))

روژنامەی « الجامعە العربیە » کە لە فەلەستین لە شاری قدس دەردەچـو لە ژمارە ٦٠٦ی روژی ١٤ حزیرانی ۱۹۳۱دا بە ناوی « سیر ویلز » کە سیاسیەکی گەورەی ئینگلیزە مقالەیەکـی نووسیوە لە بـارەی هەلگیرسـاندنی شورشـی کوردستانەوە لە تشرینی یەکەمی ۱۹۳۰دا ئەلیت : ـ

مەندوبی سامی بەریتانیا لە عیراق لە روژی ٢٤ی کانونی یەکەمی ۱۹۲۲دا لـە دوای تـەواو بونـی شورشـی یەکەمـی کـوردەکـان کـە کـرا بـو لەلایـەن شـیخ مـەحمـودەوە لـە سـالی ۱۹۱۹ وتوویەتی : حکومەتی خاوەن شکوی بەریتانیا وە حکومەتیعیراقدانیان نـاوە بە مافی نەتەوایەتی کوردا لە چوار چیوەی حکو ەتی عیراقدا حکومەتیکی کوردی دروست بکەن لە سنوری خویاندا ، ئومید ئەکەن کە کـوردەکان بە زوترین کات لە ناو خویاندا ریك بکەون لە سەر شیوەی حکومەتەکەیان وە نـوینەریان بنیرن بو بەغداد بو گفتو گو کردن لە بارەی پەیوەندی سیاسی وە ئابوریەوە لە گەل دوو حکومەتی بەریتانیاو عیراقدا

روژنامەی فەلەستین کە لە یافا دەردەچو لە ژمارەی ۳۳ ـ ۱۷۰٦دا ئـەو نووسینەی بلاو کردوتەوە لە گوڤاری « نیر ئیست »ی ئینگلیزی لە لەندەن لـە روژی ۲۳ی نیسانی ۱۹۳۱دا بلاوی کردبووە لە بارەی کیشـەی کوردەوە لـە سەر نووسی روژنامەکەیا کە وتبـوی : ـ

« لەو کەسە گیلتر نیە کەوا تی بگا کە شیخ مەحمود نەما لە ناودا کیشـەی

« ۱ » ئەم نووسینانە لە پەرتوکی من عمان الی عمالدیە نووسینی علی سیـدو گـورانی وەرگـــــیراوە .

کورد کوتای پی دیت ، ئەم نووسینەش پەیام نووسی گوڤارەکە لە بەغدادەوە ناردبوی بو لەندەن کە دەمو دوامانی مەندوبی سامی بەریتانیایە لە عیراق دیارە ئەوە بیرو یاوەری حکومەتی بەریتانیاشە ، کیشەی کورد لەوە زیاتر هیچی لی نادویم ئەلیم : « بە هەلە چو ئەو کەسەیە کە « پاشە روژیش ئەمە روون ئەکاتەوە » کە وا تی بگاکیشەی گەورەی کورد ئەو کیشە ناوچەیی‌یە بچووکەی ئیستایە کە پی‌ی ئەووتری مسئەلەی شیخ مەحمود . نەء . لەوە زور گەورە ترە مسئەلەی گەورەی کورد هەموو کوردستان دەگریتەوە یعنی هەموو وولاتی کوردستان کە ئیستا سنووری سیاسی تورکیاو عیراقو ئیران لیکی دابریونو جیای کردونەوە .

روژنامەی فەلەستین لە روژی ٢٥ حزیرانی ١٩٣١دا باسی چونی ملك فیصل ئەکا بو شاری سولەیمانی لە دوای تەواو بونی شورشی سی‌یەمی شیخ مەحمود کە لەوی ووتاریکی بە ناو دانیشتوانی شارەکەدا بلاو کردوتەوە .

ئەگەر بە وردیو پر لە تیبینی بەراوردیکی ئەم ووتارەو تصریحەکەی مندوبی سامی بەریتانیا لە عیراقا لە روژی ٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢دا بکەین باش تیدەگەین باری سیاسی بە چ جوریك گورراوە بەرامبەر بە کورد ، ملك فیصل لە ووتارەکەیا ووتویەتی : ــ

لە بیرتان نەچی ئایین هی خوایە ، نیشتمان هی هەموانە ، من جیاوازی ناکەم لە بەینی دانیشتووە خوشەویستەکانی وولاتەکەما ، نیشتان هی هەمومانە ، ئەم شاخو دولە جوانانە ملکی هەموو دانیشتوانی لواکانی تری عراقە ، بستیکیش لە خاکی لواکانی تر مافی دانیشوانی ئەم لیوایەی پیوەیە لەمەش زیاتر ئەلیم هەموو تنوکە خوینیکی دانیشتوانی

ئەم لوایە خوینی هەموو عراقیەکانە ، هەموو بران لە نیشتمانیکا ، لە خزمەت کردنی دوا ناکەون ، ئایین‌و ریگای ئایننی بو خــوایە ، ئەبی ئەمانە لە نــاو مــزگەوتو کەنشتەو کلیسەکانا بمینیتەوە لە بەینی خەلق‌و خوایانا ، بی گومان دەزانن کــە عراق دابەشس ناکریت ، هەمــووی پارچەیەک پیکــەوە لکــاوە جیا نابیتــەوە ، بەرنامەی حکومەتی نیشتمانی لە روژی دامەزرانیەوە تا ایســتاو هەتا هەتایــە ئەوەیە کە داد پەروەری بو ناو نەتەوەدا بلاو بیتەوە ، وە نەتەوە چی بوی بویان‌یکا تا ئەوانیش ببن بە کریکاریکی بەکار چاکەی وولاتیان بویت ، یاسای سەربەستی فیربون بە زبانی ناوچەیی دەرکراوە ، کورد بە کوردی فیر ئەبی عەرەب‌وتورکیش هەر یەکە بە زبانی خوی احترامی هەموو جورە ئایین‌و رەوشتیکی نەتەوایەتــی دەگیریت ، نەخشەو پیلانی باری سیاسی وولاتەکەم بە وردی کیشــراوە ئیتــر دەستکاری‌و گورینی ناگونجی ، لە بەر ئەوە پی‌ویستە نەتەوە یارمەتی حکومەت بدەن بو هەلسان بە کارو باری گشتی ، ئەگەر یەکیك سەری لی تیك چو لــەم ریگایانە لای‌دا وەکو کورەکەی نوحی لی دیت کە باوکی بانگی کردو بە گویی نەکرد ، ئەمانەی باسم کرد بو ئەوەیە کە نەتەوەکەم دلنیا بکــەم لە کارو بــاری سیاسی وولات ، لە بەر ئەوە پیویستە لە سەر ئیوە کە قولی ئازایی هەلکەن بو بوژاندنەوەو ژیانەوەی نیشتمان لە روی ئابوری‌و کشت‌و کال‌و بازرگانی‌یەوە تا شان بە شان لە گەل کارو باری سیاسی فراوان‌و پیشکەوتنی کومەلایەتی‌یــا بــروا بــەریوە .

★ ★ ★

## شورشەکانی کورد بوچی سەرنەکەوتون ؟ : ـ

لەوروژەوەی بزوتنەوەی سیاسی کورد دەستی پی کـردوەو ئەو هەمـوو شورشانەی بەرپا کراون بوچی سەرنەکەوتون ؟ دیارە هوی گەورە هەبووە کە نەیهیشتوە سەرکون ، ئەو هویانەش ئەمانەن : ـ

١ ـ نەبوونی پارتیکی پیشرەوی شورشگیری ریکخەری خاوەن پـروگرامو پەیرەویکی هەل قوولاو لە ناوجەرگەی بەرژەوەندی گەلەوە .

٢ ـ بوونی پیاوانـی ئایینیو ئاغـاو دەرەبەگ کە بە پـی‌ی پی‌ویسـت پشتگیری شورشی نەتەوەکەیان نەکردوە ، لە جیاتـی پشتگیری بە پیچەوانـە دەستیان لە گەل دوژمنانی شورشو نەتەوەکەیان تیکەل دەکـرد وە خـویان دەفروشتو ناپاکیان دەکرد بەرامبەر وولاتەکەیان ، .

پارچە پارچەبوونی‌کوردستان‌پەیوەندیەکی نیشتمانی‌لەنیوان‌شورشگیرەکانی کوردسـتاندا نەبونی یەکیەتی بـیرو باور .

٤ ـ یەکیەتی دەولەتە داگیر کەرەکانی خاکی کوردستان وە پشت گری یەکتر بو لە ناو بردنی بزوتنەوەو شورشەکانی کورد لە هەر ناوچەیەکی کوردستانـدا هەلگـیرسابی .

٥ ـ زوری چەكو تفاقی جەنگی دوژمنو سەرکەوتنی لەم روەوە .

ـ ٦ نەبوونی یارمەتی دەرەوەو نەبونی دەزگای پرو پاگـاندەو ناسـاندنی کورد بە بیگانە لە وولاتەکانی دەرەوەی کوردسـتان وە نـەبونی هاوکـاریو هاریکاری گەلانی جهان بو شورشگیرانی کورد .

٧ ـ بونی کومەلیك لە چاو چنوکانو چلکاو خوران کە بو پـارە هەمیشـە ئامادە بوون بو خزمەت کردنی بیگانەو یارمەتی دانیان لە دژ نەتەوەکەیان .

٨ ــ نەخویندەواری‌و بلاو نەبونەوەی « وعی قەومی » بە تەواوی وە بونی ناکوکی عەشایەری‌و تیرە گەری لە ناو کوردەکانا •

## ● بوچی شیخ مەحمود لە شورشەکانیا ســەرنەکەوت ؟ :ــ

ئایا ئوبالی لە ناو چونی ئەو حکومەتە ساواو خیر لە خو نەدیوەی کــورد ئەکەویتە سەر شانی شیخ مەحمود وەك هەندیك دەلین ؟ •

ئەگەر بیت‌و زور بە وردی تەماشای میژووی ئەو ماوە تەمەن کورتە بکەین کە شیخ مەحمود تیا بوە بە حکمدارو حکمداری کردوەو تا شورشی بەرپا کردوە زور باش بومان روون دەبیتەوە کە شیخ مەحمود یەکیە لە قارەمانە نیشــتمان پەروەرە دلیرو نەبەزەکانی کورد کە هەرگیز لاپەرەی میژووی ژیانی گــەردی نەگرتوەو خاوین‌و پاکە ، وەك باسکرا شیخ روحیکــی نیشتمــان پــەروەری کوردایەتی بەرزی تیا مەوجود بو وە لەکانگای دلیەوە حــەزی بە ســەرکەوتنی ولاتەکەی‌و نەتەوەکەی ئەکرد وە هەولی ئەدا کە کورد بگەیەنیت بە ئازادی‌و سەربەستی ، بەلام بە داخەوە ئەو تەیارە فکری‌و سیاسیانەی دەورو پشتیــان گرتبو مەیدانیان نەئەدایە بیریك لە پاشە روژ بکاتەوەو بو سیاسەت بە شیوەیەکی وەختی لەگەل زروف‌و کاتی ئەو روژەدا رابویریت‌و روژ بەریتە سەر •

وە ئەو ئەرکەی خراوەتە سەر شانی لە بەر بەرژەوەندی کوردو کوردستان بە باشی بیبا بە ریوەو قسەو دروو دەلەسەی ئەوانەی کە دەورو پشتیان گرتبو کاری لی نەکا ئەبوایە شیخ کەلکی لە کومەلی روشنــبیران‌و ئەفســەرە کوردە دنیا دیدە خاوەن تەجریەکان وەربگرتایەو پیرەوی ئەو ئاموژگاریانەی بکردایەو کە دەیان کرد ، وە بە چاویکی بەرزو بەریز تەماشای بکردنایە ، هەروەها وەك

ئەحمەد تەقی لە یادداشتەکەیا ئەلیت : « شیخ عبدالقادر نەهری »لە ئەستەمولەوە نامەی بو نارد وە تکای لی کرد وە ئاموژگاری کرد کە هەر چونیك بیت لـە گەل ئینگلیزەکانا تیکی نەداو روژ بەریتە سەر تا بزانین ئەم جهانە چی بە سەر دیت ، وە هەروەها شیخ مەحمود کە بە چاوی خوی دیتی تورك بەزیو ولایەتی موصلی دوراند ئیتر چون ئەبی پاش ئەو بەسەر هاتەی تورك تازە شیخ باور بکاتـەوە بە تورك وە بیەویت لە گەل تورکا ریك بکەویت ؟ وا دیـارە شیخ دلسوزانـە ویستویەتی خزمەتی وولاتو گەلی کورد بکا ، وەك پیشەوایەکی دلسوزو خاوین هەرچی لە تواناادا بوبی کردویەتی بەلام تورکیزمەکان کە دەوریان دابو نەیـان هیشتوە بیزوینەوەو خویان چونیان ویستوە بەو جورە هەلیان سوراندوە ، چونکە لەو کاتەدا مەبەستی بەرو دوای تورك وە ئوزدەمیر وە جل خوارەکانی سولەیمانی بە سەروکایەتی « تایەری ئەمین ئەفەندی » ئەوەبو کە سەر لە سیاسەتی ئینگلیز بشیوینن و شیخ مەحمود لە ئینگلیز دابرنو گیرو گرفت بخەنە سەر ریی سیاسەتی ئینگلیز لە کوردستانی خـوارودا .

شیخ محمودیش پیاویکی دل سافو خوش باور بو چونکە خوی درووو دەلەسەی نەدەزانی وایدەزانی هەموو کەس وەك خویەتی ، بویە جل خوارەکان بە ناوی ئیسلامیەتو ئایینەوە کردیان بە دوژمنی ئینگلیز وە شیخ خوشی دلـی تەواو لە ئینگلیز رەنجا بو وە لە کردەوەو کرداری حاکمە سیاسیەکانی ئینگلیـز نارازی بو وەك « میجەر سون » چونکە حاکمە سیاسیەکانی ئینگلیز دیکتاتورانە دەجولانەوەو ئەوانیش عەسکەری بوونو سیاسەتیان نەدەزانی ئەگینا ئەگـەر سیاسی بونایە ، فرو فیلی جل خوارەکان وە پیلانو نەخشەکانی « تایەری ئەمین ئەفەندی » زال نەدەبو بە سەر سیاسەتی ئەواناو دەست بەرداری پیاویکی راستی وەك شیخ مەحمود نەدەبون .

ئەمە لە لایەکەوە ، لە لای تریشەوە ، لە سەرەتاو گەرمو گوری شورشی شیخ مەحمودا عەشایەرەکانی دەورو پشتی سولەیمانی هەموو سویند خواری شیخ مەحمود بونو پشتیان گرت ، بەلام ئینگلیز بە فرو فیلی خوی توانی سەروك عەشایەرەکان راکیشی بە لای خویا بە پارەو هەموویان لە شیخ مەحمود دابری ، ئەو سەروك عەشیرەتانەی دەستی شیخیان بریو سویندیان بو خوارد هەموو شیخیان بەجی هیشتو کشانەوەو شیخ مەحمود لە کوری شەرا بە تەنیا مایەوە، بویە شیخ مەحمود وەك لەوە پیش باسکراوە خوی دانی ناوە بەم کردەوەیەدا وتویەتی ، لە شورشا نابی پشت بە عەشایەر ببەستریت ، ئەوەبو لەوە پیش سەرو کعەشیرەتەکان هەموو سویند خواری من بوون کەچی پاش دوو شەر هەموو پالیان دا بە دوژمنەوە کە ئینگلیزەو پشتی منیان بەردا .

ئەم هویانە بونە کوسپو هاتنە بەر شورشەکانی شیخ مەحمود ئەگینا ئەوەتی میژووی کورد هەیە هیچ میژوو نووسیك ناتوانی بلیت شیخ مەحمود پیشەوایەکی نیشتمان پەروەرو دلیرو دلسوزو پاك نەبوە ، بەلکو کورد هیشتا پیاوی وا هەلکەوتو دلیرو ئازاو خاوەن عزەتی نەفسی بەرزی نەهیناوە ، بەلام ئاخ لە گەل ئەم هەموو رەوشتو خوە جوانانەو ئەم پاكو خاوینیە لە سیاسەتا دەستی ببوایە یان راوێژ کەری سیاسی راستی لە دەورو پشت بوایە ، جا لیرەدا ئیمە ئەبی بە وجدانیکی پاکەوە بلیین ، بوچی شیخ مەحمود لە سیاسەتا دەستی نەبوە ؟ .

سیاسەت مانای فرو فیلی زورە بە پیی کاتو ساتو زروفی ئەو کیشەیەو کاتی .

## سیاسەت چیە :ـ

لە پەرتووکی « سیاسة الحکم » نووسینی « اوستن رنی »و تەرجمەی عەرەبی دکتور حسن علی الذنـون لە لاپەرە ١٠ و ١١و ١٢و ١٣و ١٤دا باسی سیاسەت ئەکات ئەلیت :ـ

زوربەی زوری ئەمریکایی‌یەکان ئەلین سیاسەت کردەوەیەکی پیسە ، سیاسیەکان بە تایبەتی ئاژاوە نیرەوەو خو هەلکیش‌و فشە کەرو رەوشت نزمن ، سیاسیەکان تەنیا ئیهتمام بە چاکەو دەست کەوتی خویان‌و ئەوانەی سەر بەوانن ئەدەن ، هەمیشە لەئیشیك دەگەرین کە سەرەنجی جەمهور رابکیشی ئەگەرچی زور باش بزانن ئەو ئیشە راست نیە ، سیاسی هەرگیز تەماشای پاشە روژیش ناکەن ،ئەو کات‌و ساتەی ئەوانی تیان‌چی بوی ئەوە دەکەن،بویە ئەمەریکایی‌یەکان ئەلین روزفلت یەکیك بوە لە پیاوە گەورەکانی دەولەت ، وە هەروەها ئەشلین نزمترین سیاسی بووە لە ماوەی ژیانیا و هەر بەم جورە « وینستون چەرچل »و « دوایت ئایزنهاوەر » وە « ریتشارد نیکسون » ، بویە ئەلیین سیاسەت عبارەتە لە فرو فیل‌و پیلان‌و تەلەکە بازی بە شیوەیەکی رەسمی‌و مشروع بە ناوی ریکخراویك یا ن‌حکومەتیکەوە بو گەیشتن بە مەرام‌و مەبەست‌و ئامانجە نەخشە کیشراوەکانیان ، •

جا واتە شیخ مەحمودی نەمر دور بوە لەم رەوشت‌و خوانەو دور بوە لەم صفاتە ناشرینانە بویە وترا سیاسی نەبوە ، کەوابو ئەوانەی ئەم پەرتوکە ئەخویننەوە باش تی‌بگەن‌و نەلین بوچی وتراوە شیخ مەحمود سیاسی نەبوە ، چونکە راست وتراوە ، ئەمە لە لایەکەوە ، لە لای تریشەوە لە بارەی هەلخەلەتاندنی کوردەکان بە ناوی دین‌و برای دینیەوەو باور کردنیان بە مصطفی

کمال به م‌ناوه‌وه‌و یاریده‌و یارمه‌تی دانی‌و رزگار کردنی له ته‌نگ‌و چه‌له‌مه‌ی لــه ناو چون ، که‌چی له پاداشتی چاکه‌دا مصطفی کمال ئه‌وه‌ی پی کردین که کردی ئه‌و مصطفی کماله‌ی که خه‌لافه‌تی ئیسلامی له ناو بردو دینی له تورکیادا کز کرد ،

با هیچ دوور نه‌روین له کاتی سه‌ر کوماری عبدالســـلام عارف‌دا هه‌مـــوو دیمان چون به ناوی ئیسلام‌و دینه‌وه کونگه‌ره‌ی ئیسلامی به‌ست وه علماو مه‌لای دنیای کوکرده‌و ه‌بو ئه‌وه‌ی فتوا ده‌رکه‌ن بو له‌ناو بردنی نه‌ته‌وه‌ی کورد ، جابه‌مه ئه‌وتری مسولمانه‌تی یان شتی تر ؟ .

ئه‌گه‌ر چاویك بخشینین به لاپه‌ره‌کانی میژووی کوردا ده‌بینـــین زور شتی وا رویداوه ، یه‌کیك له‌وانه محمد پاشای ره‌واندزی که به پاشا کویره بـــه ناو بانگ بو ئه‌م پاشایه ئه‌وه‌نده سه‌رکه‌وت ئیمپراتوریه‌تیکی کـــوردی پیکه‌وه‌نا که‌چی مه‌لایه‌کی دینـــی « مه‌لای خه‌تـــی » به ناوی دیـــن‌و برایه‌تـــی دینیـــه‌وه هه‌لی خه‌له‌تاندو ته‌سلیمی کرد به تورکه‌کان‌و ئه‌وانیشـــس کوشـــتیان وه حکومه‌ته گه‌وره‌که‌شی له ناو چو ، جا که وتراوه به ناوی دین‌و برای دینیه‌وه کورد هه‌میشه هه‌ل‌خه‌له‌تینراو ه، راسته ، کورد له ژیانیا راسته ، فرو فیل‌و حیله بازی‌و ته‌له‌که بازی نازانی ، صریحه له قسه کردنیاو زور به توندی‌و به باوریکـــی قایمـــه‌وه دینه‌که‌ی ده‌پاریزی ، که به‌لینیکی دا له‌و به‌لینه پاشی گه‌ز نابیته‌وه ئه‌گه‌ر سه‌ری خو ی‌له‌و ری‌یه‌دا داناوه ، له پیناوی پاراستنی دینیا نیشتمان‌و گـــه‌ل‌و وولات ده‌فه‌وتینی ، جا بویه بیگانه دوژمنه‌کانمان هه‌میشه که‌لك‌و سودیان له‌م ره‌وشته وه‌رگرتوه و ه‌له چ کاتیکا ته‌نگه تاو بوبن بابه‌تی برای دینی‌و دینیان له گـــه‌ل کوردا هیناوه‌ته مه‌یدان وه ئه‌و شا ده‌ماره‌یان گرتون به ئاره‌زوی خویان چونیان

ویستبی کوردیان کیش کردوه تا سەرکەوتون ، کە گەیشتون بە ئامانجیان ئنجا وەرسوراونەوەبە توندی لە کوردیان داوە لە پاداشتی چاکەیدا! •

جا بویە ویستم ئەم بابەتە گرنگە کە نووسەرانی کورد تا ئەمرو نەیانتوانیوە خویانی لی بدەنو بە ئاشکرا لەم ابەتەبدوین من بە یەلگەی تأریخیو یە کارەساتی روداو روونم کردەوە کە دوژمنانی کورد هەمیشە بە ناوی برای دینیەوە کوردیان هەلخەلەتاندوە •

بویە ئەلیم خویندەوارانی بەریز کە ئەم پەرتووکە دەخویننەوە ئەبی باش لەو ەبگەن کە مەبەستی بەرو دوای من ئەوەبوە کە ئاموژگاری نەتەوەکەم بکەم کە زور لەم روەوە وریاو ئاگادار بن تا جاریکی تر بەو ناوەوە نەتوانری لە خشتە ببرین وە من هەرگیز مەبەستم ئەوە نیە کە بە خراپە ناوی دینو برایەتی دینی بینم ئەگەر بو بەرژەوەندی گشتی بە کاربهینری • بو ئەم مەبەستەش خوای گەورە ئاگادارە •

★★★

## ئەو سەر چاوانەی کەلکیان لی وەرگیراوە لە نووسـینی ئــەم پەرتوکــە سـیاسیەدا

١ ـ شەرەفنامە « شرف‌الدين خانی بدليسی » لە فارسـيەوە •

٢ ـ من عمان الی عماديه « عەرەبی » « جـوله في كردستان الجنـوبی » نووسينی ماموستا علی سيدو گـورانی•

٣ ـ في غمرة النضال مذكرات المحامی سليمان فيضی عـەرەبی •

٤ ـ المجله العسكريه العراقيه العدد ٢ السنه ٣ العام ١٩٢٦ مقـال مقـدم حسين نوری « عەرەبی » •

٥ خناجر وجبال « قاسم والاكراد » باللغه العربيه للاستاذ احمد فوزی

٦ تأريخ العراق القريب « مس بيل » باللغه الانجليزيه ترجمه جعفر خيـاط عـــەرەبی •

٧ ـ القوميات العراقيه « جرجيس جبرائيل هومی » طبع بغداد ١٩٥٩ عەرەبی

٨ ـ «كردستان والاكراد » دراسه سياسيه واقتصاديه للدكتور عبدالرحمن قاسـملو ـ عەرەبـی ـ

٩ ـ الاكراد للاستاذ مينورسكی ترجمه الدكتور معروف خزنەدار عەرەبی

١٠ ـ « المسأله الكرديه » بحث اجتماعی وتاريخی منشورات مركزدراسات قضايا العالم الاسـلامی المعاصر « جواس بلاو » ـ فرنسی ـ

١١ ـ الاكراد والقانون من مولفات «تومابوا»او «لوسيان رامبوت»باريس ١٩٤٧ •

١٢ ـ تفاصيل عن حياة الاكراد مقال للسير مارك سايكس حول القبائـل الكرديه في الامبراطوريه العثمانيه • « انجليـزی » •

١٣ ـ النساطرة وجيرانهم المسلمون « جـون جـوزيف » ٠
١٤ ـ پريم سوبينى « كوردش ساموڵويچين » ٠
١٥ ـ رۆژنامەی «ليمونـد »ی فەرەنسی لە رۆژی ٢٦ی كانونی یەكەمی ١٩٥٩ ٠
١٦ ـ ای ٠ ای ٠ تسـوكارمان « مبادی النحو الكردی » موسكو ١٩٦٢
١٧ ـ « انا باسـس » كزینفون باللغه الفارسیه وەرگیری بە كوردی بـە ناوی « كوردستان شوێنی دە هەزار یونانی لە ٤٠١زدا » حسن فهمی جاف ٠
١٨ ـ « تشتیت الاكراد في الازمنه القدیمه » رۆژنامەی كومەڵی اسپـانی شـاهانه تشـرینی یەكەمی ١٩٢١ ٠
١٩ ـ كوردەكانو وولاتەكەیان نووسەر « كاپتان شـیخ ٠ أ ٠ وحیـد پاكسـتانی « أنجـلیزی » ٠
٢٠ ـ شـورشەكانی كـورد « ماموستا علاءالدین سـجادی »كـوردی
٢١ ـ تأریخی كوردو كوردسـتان معالی محمد امین زەكی بەگ كوردی
٢٢ ـ تأریخی سـولەیمانی معالی محمد امین زەكی بەگ كوردی
٢٣ ـ ریگا بە ناو كوردسـتاندا ، ای ٠ ام ٠ ٠ هاملتون انجلـیزی
٢٤ ـ توركو كوردو عەرەب میجەر ئادموندس انجلیـزی
٢٥ ـ یادداشـتی خوا لی خوشبو ئەحمەد تەقی « دەست خەت » كوردی
٢٦ ـ یادداشتی خوا لی خوشبو رەفیق حلمی بەگ بەرگی شەش كوردی
٢٧ ـ یادداشتی رەشید جودەت بـە گ ٠
٢٨ ـ كتاب الانسـاب والتسلسل التأریخی الاسلامی « ئی ٠ دی ٠زامبور»
٢٩ ـ میسیو بوتامیا ١٩١٧ ـ ١٩٢٠ سیر ئارنولد ویلسون انجلیزی
٣٠ ـ مصطفی كمال « الذئب الاغبر » ایچ ٠ اس ٠ئارمسترونگ عەرەبی

٣١ ــ مقتطفات من مجله اوريانت الفرنسيه « جان پير فينيو »
٣٢ ــ كردستان جغرافياى طبيعىو سياسىو اقتصادى كردستان « فارسى»
نووسينى « على اصغر شـميم »
٣٣ ــ « الضحايا الثلاث » للاسـتاذ المنعـم الغـلامى عەرەبى •
٣٤ ــ ميژوو پوتامياو كوردستان ميجەر اى•بى• سون لندن ١٩٢٦ انجليزى
٣٥ ــ پرسيارو دەمە تەقى لە گەل هونەرمەندى بەناو بانگ « على باپـير
اغا » كە خوى لە سەردەمى حكمرانى شيخ مەحمودا لە سولەيمانى سكرتـيرى
حاكمى سياسى سليمانى بوە وە شارەزايى زورە لەو كارەساتو روداوانەى كـە
رويداوە لەو سەردەمەدا زور بە وردى هەموو شتيكى بو روون كردمەوە • وە
هەروەها چاوم ە زور لەو كەسانە كەوت كە لە شورشەكـانى شيخ مەحمـــود
بەشدار بون وە مراكزى حساسيان هەبوە بەلام نەيان ويست ناويان بەرم •

★ كوتايـــــى ★

# سوپاسیکی پر بە دل

پاش تەواو بوونی لە چاپدانی ئەم پەرتوکە سیاسیە بە کول‌و بە دل سوپاسیکی گەرم‌و گوری برایانە پیشکەش ئەکەم بەو کریکارانەی چاپخانەی ژین کە زور خویان ماندو کرد لە چاپ دانی‌دا داوا لە یەزدان ئەکەم کە هەمیشە لە کامەرانیدا بن ، ئەوانیش: ــ

پیت ریکخەری « ئینتیر تایپ » کاك پشکو توفیق ، کاك مجید کەساس کاك عمانوئیل میشو سندی‌و کاك حمە رضا وە کاك شیرکو توفیق‌و کاك فایق محمدو کریکاری بچوك‌و قارەمان جەزا کەساس •

رەمزی قەزاز

# ئەوەی لەم پەرتوکەدا نووسراوە : ـ

لاپەرە

| لاپەره | دير | هەله | راست |
| --- | --- | --- | --- |
| ٥ | ٩ | کودر | کورد |
| ٧ | ٤ | ممیس | سیاسی |
| ٧ | ١٧ | ـەم | بەم |
| ٨ | ٢٠ | وەـگرت | وەرگرت |
| ١٠ | ١٧ | الاکرند | الاکراد |
| ١٠ | ٢١ | دـاسە | دراسە |
| ١٠ | ٢١ | عبدالرحما | عبدالرحمان |
| ١١ | ٢١ | ونتصادیەد | واقتصادیە |
| ١٢ | ١٠ | دەگتاە | دەگاتە |
| ١٢ | ١٦ | دـاسە | دراسە |
| ١٤ | ٢١ | مینوـسکی | مینوروسکی |
| ٣٤ | ٤ | سان | عثمان |
| ٣٦ | ١ | سیراق | عیراق |
| ٣٦ | ٤ | دابش | دابەش |
| ٣٧ | ١٥ | دەرکردەوە | بیریاندەکردەوە |
| ٣٨ | ٣ | عیاقدا | عیراقدا |
| ٣٩ | ٥ | جاکرین | چاکترین |
| ٣٩ | ٧ | ە جد | ماجد |
| ٣٩ | ١٠ | کردنا | کردنیا |
| ٤٠ | ٣ | کرنی | کردنیان |
| ٤٠ | ٦ | سەرك | سەرەك |
| ٤١ | ١ | فریندران | فرینران |